وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی

ئەندامی کارا
مەسعوود محەمەد

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد
بەغدا – 1974

کتێبی «وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی» بریتییە لە پێشەکییەک و دوو گوتاری سەربەخۆ:

- یەکەم: «بەکارهێنانی «ی» لە زمانی کوردیدا» - وەشانی یەکەم :گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم ساڵی1974
- دووەم: «سوورێکی خامە بە دەوری ڕاناودا» – وەشانی یەکەم: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ساڵی1974

پەخشانی ئینتەرنێت
www.mamosta.net
ستۆکهۆڵم 2008

## پێشەکی

زمانی کوردی لە هەموو مێژووودا خاوەنێکی دەسەڵاتدار و دڵسۆزی نەبووە. لەوەتەی مادەکان لێیان تێک چووە، بەر لە 2500 ساڵ زیاتر، میللەتی کورد خاوەن کیانی سیاسی و حکومەت نەبووە تاکوو توانیبێتی خزمەتی زمانەکەی بکا و بەرەو ژوورتری ببا بەهۆی سازدان و لە چەرخ دانیەوە بۆ بەکارهێنانی ئەدەبی و ڕەسمی و هونەری یاخود هەر نەبێ ڕێزمان و دەستوورەکانی بپارێزێ و وەک زمانێکی یەکگرتوو لە سەرانسەری کوردستاندا بیهێڵێتەوە. مەل و گیای دەشت و دەر چەند لەخۆوە دەژین و زۆر و کەم دەکەن و ڕێکەوتی خۆش و ناخۆش بەرەوپێش و بەرەو پاشیان دێنێ و دەبا زمانی کوردیش، لە چاو زمانەکانی تری خاوەن کیان و حکومەت، هێندە خۆڕسک و بێ شوان و باغەوان و پەرژین و ئاو و دان بووە. لێرە بە پێشەوە نە دەسبژارێک کراوە، نە خزمەت و خۆراکێکی دیوە نە یارمەتییەک دراوە لە کەوتن ڕاست بێتەوە یا خود بە سەر پێیانەوە تاقەتی ڕاوەستانی هەبێ. تازەبەتازە نەبێ بە جۆرێکی سەرەتایی و کەوت و ڕەوت پشکنینەوەی تێدا دەکرێ و هەوڵی بەرەوپێش بردنی دەدرێ، لە کۆنەوە نەبیستراوە چ لایەنێکی دەسەڵاتدار خۆی تێگەیاندبێ مەگەر خۆتێگەیاندنی دوژمنانە و ناحەزانە. ئەمەی لێرەدا دەیڵێم وەک بەڵگەنەویست (بدیهیە) دێتە بەر چاوان، یەکێک بیەوێ نەیسەلمێنێ ئەرکی هێنانەوەی بەڵگە بۆ نەسەلماندن دەکەوێتە ئەستۆی خۆیەوە.

مێژووی میللەتی کورد بە هەموو تاریکی و نەزانراوی و بێتۆژینەوەی خۆیەوە هێشتان لە زمانی کوردی بەرچاوتر و شوێنەوار ڕوونتر: ڕەنگە بتوانین کورتە باسێکی بەسەرهاتی میللەتەکەمان بگێڕینەوە، پێ بە پێ لە چەند هەزار ساڵێکەوە تا ڕۆژانی ئێستا لەگەڵیدا سەرەوژێر بینەوە و تا ڕادەیەکیش لەو

بەسەرهاتە بگەین و هۆی ڕوودانی، کەم کەم، بە دەستەوە بدەین، بەڵام زمانەکەمان زۆر و کەم سەرگوزەشتی نیوە مەعلوومیشی نییە، کەس ناتوانێ و نازانێ بڵێ بەر لە هەزارساڵ زمانی کوردی چۆن بووە و لەهجەکانی لە چ بارێکدا بوون، فەرهەنگی وشەکانی چەند بوو، ڕێزمانی ئەوسای لە چاو هی ئێستای چ جوداوازییەکی هەبوو، دواتر چی بەسەر هات و لە کام ڕێبازەوە بەرەو شکڵی ئێستاکەی گلێر بووە... پێشتر چۆن بوو، کەوتبووە بەر تاوی کام سەقافەت، چەند لەهجە بوو، لەهجەکانی لە چییەوە پەیدابوون و چۆن لە یەکتر دوور کەوتنەوە، بۆچی دوور دەکەوتنەوە.

پوختەی گوتە ئەوەیە تا ئێستا ئەوەی لە باری مێژووی زمانی کوردی و لەهجەکان و فەرهەنگ و ئەدەب و فۆلکلۆریەوە دەزانین هەر ئەوەیە کە لە هەڵکەوتی ئێستاکە و ڕابردوویەکی زۆر نوێ بۆمان دەردەکەوێ، هەرچی هۆی بەستنەوەی ڕابردووی کۆنی بە ئێستاکەیەوە هەیە لێمان بزرە. پاشماوەی زەردەشت و ئاڤێستا، بە نیسبەت زانستی ئێستامانەوە، بە تەواوی پچڕاوەتەوە لە ڕۆژگاری دوا خۆیانەوە. کەمتاکورتێک لە زانیاری مامۆستاکانی ئەم چەرخە دەربارەی ئاڤێستا و نزیکی و دووری لە کوردی ئەم ڕۆژانەمان بایی ئەوە ناکا چ هەنگاوێکی گرنگی پێ باوێین بەرەو دۆزینەوەی پەیوەندی میانی زمانی کوردی ئەوسا و ئێستا و جۆر و هۆی گۆڕانی لە شکڵی کۆنیەوە بۆ هی چەرخەکانی نوێی.

پڕ کردنەوەی بەتاڵایی و کەلەبەر لە زانستەکانی «کوردناسی» دا بەندە بە چالاکی پسپۆڕانەی ئارکایۆلۆجییەوە: بە لای باوەڕی منەوە ئیمکان نییە نەخشەیەکی مەفهوم و قەناعەت هێنی مێژووی بەسەرهاتی کورد و زمانی کوردی بکێشرێ بەر لەوە زاناکانی ئاسار لە ژێر خاکی کوردستانەوە مەعلومات بەسەر بخەن. دەبێ سینەی گۆڕستانی مێژووی کورد کە خاکی کوردستانە لە چەندین جێگە ماسیدڕی لێبدرێ و چین چین ڕابردووی بە سەر یەکتردا تەپیوی وەک پەڕەی کتێبێ شڕ هەڵدرێنەوە و واتاکانیان لێک

بدرێنەوە. زانایانی ئاسار کاری یەکجار گرانتریان کردووە لە دەرهێنانەوەی مێژووی کورد کە میللەتێکی زیندووە و بە خۆی و مەفتەنیەوە درێژەی ئەو ڕابردووە ژێر خاک بوویەوە: مێژوو زمانی گەلێک میللەتی لەناوچووی خرانەوە سەر ڕووپەڕەی زیندەگانییەوە و بوونەوە زانیاری سەرەتایی کە لە فێرگەکان بە دەرس دەخوێندرێن، وا هەیە ڕێزمانیشیان دۆزراوەتەوە و کتێبی لە سەر دانراوە. هەڵکەندنی گردی «شمشارە» لە خوارووی ڕانیە...
ڕووناکاییەکی گرنگی خستە سەر باری ئەو ناوچەیە و پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتی دراوسێ و دوور و نێزیکیەوە لە ڕۆژگارێکدا کە هەزار ساڵ زیاتر پێش زەردەشتەوە دێت. لەم هەڵکەندنە و دۆزینەوە و خوێندنەوەی خشتە سوورکراوەکانیەوە، بۆ یەکەم جار لە هەموو مێژوودا، زانرا ناوەکانی ئاوایی و گردە دەسکردەکانی ئەو ناوچەیە لە نزیکەی چوار هەزار ساڵەوە گۆڕانێکی کەم نەبێ بە سەریاندا نەهاتووە. ناوی «شمشارە» خۆی ئەوسا «شووشەرا» بووە، چەندیش دێ و وێرانگەی تریش لە ناوچەی بیتوێن و ڕانیەدا هەر ئەو ناوانەیان هەبووە کە ئێستا هەیانە وەک دێی «کامەریان» کە ئەوسا«شیمەرینی»[1] بووە...

ئەم دۆزینەوانە سرنج بۆ هێندێ دەبەن کە وا هەر لە یەکتر چوونێک لە میانی ناوێکی کۆن و یەکێکی نوێ لە ئاواییەکانی کوردستان بێتە بەر چاو، هەڵدەگرێ ببێتە بەڵگە و یەکبوونی ئەم دوو شوێنە بسەپێنێ.

جگە لە ناوەکان، کەوا کەرستەیەکی زۆر گرنگی زانستی و مێژوویی بەرهەم دێنن بۆ بە یەکەوە بەستنەوەی ڕابردووی کۆن و نوێی کورد، لەو نووسینانەی سەر خشتەکان فەرهەنگۆکێکی وشەی عادەتیش پێک دێت لێی دەوەشێتەوە بەراورد بکرێت دەگەڵ فەرهەنگی ئێستای زمانی کوردی: نووسینەکان بە زمانی«خووری». نووسراون و لە لایەن پسپۆڕێکی زمانەکەوە لە خەتی «میخی» یەوە بۆ خەتی لاتینی گۆڕاون و بە زمانی ئینگلیزیش تەرجەمە کراون. هەرچەند نووسینەکان تۆژینەوەیەکی زۆریان دەوێ و جارێ بە

جۆرێکی سەرەتایی بڵاوبوونەتەوە و تەرجەمە کراون، لەگەڵ ئەمەشدا لە بەرچاوی من دروشم و ڕەنگ و شێوەی زمانی کوردییان تێدا دەدۆزرێتەوە. ئەگەر چاوم ڕەشکەوپێشکەی نەکردبێ لە دیتنی شێوە و تارمایی زمانی کوردی لەو نووسینانەی گردی «شمشارە» و بە تەواوی ساغ بێتەوە کە وا زمانی کوردی ئێستا و زمانی خووری کۆن لە یەک دەکەن هەنگاوێکی زۆر فرەوان بەرەو پێشەوە دەچین لە سەپاندنی ئەو کۆنەباوەڕەم کەوا میللەتی کورد و «خووری» هەر یەکن وەیا خود هەر نەبێ خووریەکان ڕەگەزێکی زلن لەو شادەمارانەی ڕایەڵەی «کوردایەتی» پێک دێنن. لێرەدا نموونەیەک دێنمەوە لەو ڕستە خوورییانە کە وا بەسەر خشتە سوورکراوەکانی شمشارە نووسراونەوە

لە ژمارە 13 ی گۆڤاری «سۆمەر» ی ساڵی 1957 لە گوتاری پرۆفیسۆر ج لێسۆ ئەم ڕستەیە بە نووسینی لاتینی دەخوێنیتەوە کە ڕستەکە خۆی بە زمانی خوورییە «tuappa sa tusabilam» واتای ڕستەکەش بە زمانی ئینگلیزی بەم جۆرەیە کە لە هەمان جێگە لە گوتارەکەدا تۆمار کراوە your letter which you sent me واتای ڕستەکە بە کوردی ئەمە دەردەچێ «نامەکەت لە بۆ ناردبووم». کە ورد بیتەوە دەبینی لە (نووسینەکەی خووری)دا دوو جاران وشەی tu دێنەوە کە وا بە زاهیر «توو» ی کوردی ئێستاکەیە. لە کۆتایی ڕستەکەشدا پیتی «m» هەیە کە ئەویش ڕاناوی کەسی یەکەمی تاکە لە کوردی ئێستاکەدا وشەی «sabila» بە لای باوەڕی منەوە ئەویش «سپارد، ڕاسپارد» ی ئێستاکەی کوردی خۆمانە. وەنیە من چ دیراسەیەکی زمانی خووریم کردبێ، چی لێرەدا دەیڵێم خوێندنەوەیەکی سەربێ و ڕواڵەتی ئەو ڕستانەیە کە لە گوڤارەکەدا نووسراون. جا ئەگەر ئەم یەکبوونەی کورد و خووری بە تەواوی ساغ بووە و سەلماندمان زمانی ئێستای کوردی نەوەی زمانی خوورییەکانە ڕاستەوخۆ هەزار ساڵێک لە ئاڤێستا زۆرتر دەکەوینەوە بەرەو دۆزینەوەی کۆنترین سەرچاوەی نووسراوەی کوردی.

بە هەمە حاڵ هەڵکەندنەکانی «شمشارە» زەخیرەیەکی زلی مێژوویی بە دەستەوە دا و ڕووناکییەکی بە هێزی خستە سەر گەلێک باری نەزانراوی ناوچەی ڕانیە و بیتوێن و ئەو شوێنەی پەیوەندییان پێیەوە هەبووە لە دوور و نیزیکەوە. دەوجا کە هەڵکەندنی تاکە یەک گرد ئەو هەموو ئەنجامە بە دەستەوە بدا تۆ بڵێی ڕووپێو کردنێکی سەر لەبەری کوردستان بە پشکنینەوەی ئارکایۆلۆجی دەبێ چمان بۆ پەیدا بکا؟، بێگومان بەرهەمێکی لە ئەندازە بە دوور.

لێرەدا دەمەوێ لە خوێنەری کورد بگەیەنم، بە پێی باوەڕی خۆم، دۆزینەوەی بنجەکانی زمان و ڕێزمانی کوردی بەندە بە تۆژینەوەی ئارکایۆلۆجی لە سەرانسەری، یا خود بەشی زۆری کوردستاندا. ئەم تۆژینەوەش تا ئێستا نە هیچی ئەوتۆی کراوە ببێتە بناخەی دیراسەیەکی فیلۆلۆجی کە خۆ پێوە ماندوو کردن بهێنێ، نە چ موژدەیەکیش لە ئاسۆی کوردستانەوە هەواڵی تۆژینەوەیەکی ئارکایۆلۆجی نێزیکمان بۆ دێنێ. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر لەم لەحزەیەدا پێمان بڵێن بڕیار دەرجوو لە لایەن میللەتە یەکگرتووەکانەوە کە زانایانی ئارکایۆلۆجی و کوردناسی خەریکی هەڵکەندن و ماسیدرِ لێدان بن لە هەموو بستێکی خاکی کوردستاندا کە گومانی تێدابوونی ئەنتیکی لێ دەکرێ، دەبێ ساڵەهای ساڵ بە دیار بەرهەمی ئەو هەوڵ و تەقەللایە زانستییانەوە ڕاوەستێن تا دەردەست دەکرێن و دەزانرێن و پوختە دەبن و دێنە قاڵبی سوود لێ وەرگرتنەوە. ئەم کارە خەیاڵییە کە چەندین ساڵی پێدەوێ، کاری حەقیقی دەیان و زیاتر لە دەیان ساڵی پێدەوێ. ڕەنگە خەیاڵەکەش هەر نەیێتە دی...

ئەمە ڕاستێکە دەمەتەقە هەڵ ناگرێ. کەواتە چاوەنۆڕ کردنی ڕوونبوونەوەی مێژووی میللەتی کورد بە نیازی خۆ هەڵگرتن بۆ ئەوە ئەوساکە دەست بکرێ بە دۆزینەوەی دەستوورەکانی زمانەکان، سەرەڕای ئەوە کە کارێکی دوو بەختییە (یا دەبێ یا نابێ) یەک خستنی هەموو توانایەکیشە لە مەیدانی

زمانزانیدا بە دیار ئومێدێکی مەوهوومەوە بۆ ماوەیەکی کۆتایی بزر. تا ئێستا هیچ میللەتێک لە هیچ مەیدانێکی زانستدا، زمان بێ یا شتێکی تر، دەست و قەڵەمی خۆی ڕەق نەکردووە بە هۆی ناتەواوی مەعلوومات تێیدا:
فەلەکناسەکان ئەگەر پەیڕەوی ئەم تێفکرینەیان کردبا و ڕاوەستابان تا ڕۆژگاری ئاسمانگەردی، دەبوا ورتەیان لەبەرەوە نەیێ نەک هەر لە سەردەمی سۆمەر و بابل و میسری کۆن و یۆنانەکانەوە بگرە تا گالیلۆ و کۆپەرنیکۆسیش... بەم گەز و گرێیە ڕەنگە ئێمرۆش فەلەکناسان مافی قسە کردنیان نەبێ لە باری ئاسمانەوە بە هۆی ئەوەوە کە هێشتا زانستی فەلەک لە چاو پانایی و قووڵایی بێ بڕانەوەی جیهاندا وەک قەترە بە دەریایە. دەبوو فینیقیەکانیش دەریاگەڕی نەکەن چونکە هێشتا چی ئەوتۆ لە بارەی دەریاکانی هەموو جیهانەوە نەزانرابوو لەوەگەڕێ زانستەکە تۆماریش نەکرابوو. کە قیاس لە زمان و ئاسمانگەردی و دەریاپێوی بکەیت هەموو زانستەکانی تریش دەبوو خەویان لێ بکەوێ تا کاتێکی کەس نەزانیوە.

لەوڕا مەعلووم دەکرێ ئەو دەنگ و سەدایەی کە ناوناوە دێتە بەر گوێمان و موژدەیەکی غەیبی بە کوردی دەدا و پیرۆزباییشی لێ دەکا بە بۆنەی ڕوون کردنەوەی مێژووی زمانەکەمان هەر لە زەردەشتەوە تا تا ئیمرۆ لە ڕێی هەوڵ و تەقەڵلای زانست کارانەی خۆیەوە، چ بنج و بناوانێکی ئەوتۆی نییە دڵ خۆش کا.. دەنگ و سەدایەکە هەر بە موژدە دانیش ڕازی نابێ، لە ژێر لێوەوە تێشمان دەگەیەنێ کەوا خەریکبوونی شارەزایانی زمان بە دانانی دەستووری ڕێزمان بۆ ئاخاوتنی کوردی ئەم دەڵێم خۆشم دەزانم دۆزینەوەی داوی پەیوەندی میانی کوردی کۆن و لەهجەکانی ئێستاکەی کارێکە لێی دەوەشێتەوە پەیکەری زێڕی بۆ داڕێژرێ و خاوەنەکەی بە پێشەوای سەرلەبەری ڕۆشنبیر و نووسەر و زانایانی کورد لە قەڵەم بدرێت و وەک احمد شوقی بکرێ بە میری کوردستانی، تاج و گۆچانی ئیمارەتی پێ بدرێت. بەڵام حەز کردن و خۆش ئامەد کردنی من لە شتێک نابێتە پێک هێنەری ئەو شتە... کوێر حەز لە دوو چاوی ساغ دەکا و نیوە چاوێکی ساغیشی

پێنابڕێ... هەر وەک دەزانم کەس نییە بتوانێ قورسایی 10 تەن هەڵگرێ وەیا بە دەست لێکدان ڕەهەوا کەوێ و بفڕێ، وەیا بە بازێک لە دجلە بپەڕێتەوە هەر وەهاش دەزانم، تۆش دەزانیت، بە کەس ناکرێ لەهجەکانی ئێستاکەی کوردی بە ڕێی شەقامەڕێدا بپەڕێتەوە بۆ سەردەمی زەردەشت و پێشتر: ئەم هەموو زانستەی فیلۆلۆجی و کوردناسی و ئارکایۆلۆجی و مێژووی ڕۆژهەڵاتی نێزیک و ساغ کردنەوەی تاو و تەئسیری تێکەڵبوون و تێک هەڵقژان و تێک چرمسانی میللەتان و زمانەکانی ئەم ناوچەیە پان و بەرینە لە ماوەی دوو سێ هەزار ساڵاندا کاری تاکە کەس نییە، کاری جیلێکی سەرلەبەریش نییە: نەفەسی ئەم کارە لە عومری تاکەکەس و تاکە جیل یەکجار درێژترە سەیری ئاشوورناسی بکە کە وا لە 100 ساڵ زیاترە زاناکانی ئاسار تێیدا خەریکن و جیلا و جیل زانستەکانیان بۆ یەکتر دەور و تەسلیم دەکەن و هێشتانیش بە ڕێگاوەن.

بڕیاری دواڕۆژ چی دەبێ با ببێ لە بارەی ڕوون کردنەوەی مێژووی کورد و زمانی کوردییەوە، گریمان دەستێکی بە قودرەت ئەم مێژووەی بۆ خستینە بەر تیشکی نێوەڕۆ و هەندێ کتێبێکی چاپ کراوی خەت خۆشی بێ هەڵە ئاسان بوو بۆ خوێندنەوە و بۆ تێگەییشتنیشی، ئا لەم حاڵەشدا کە حاڵی بەهەشت دەکا نەک هی زەوی، خەریکبوون بە ڕێزمانی ئاخاوتنی ئێستا کەمانەوە هەر بە ملەوەیە و دەبێ بکرێ و بنووسرێ و بڵاو بێتەوە و بخوێنرێتەوە. بۆیەیە تۆژینەوەی فیلۆلۆجی و ڕێزمانی لەم ڕۆژگارەدا بە هەموو حاڵ پێویستی سەر شانی زمانەوانانە، هەر یەکەیان بە قەدەر توانای خۆی. ئامادە کردنی دیراسەی «خورد یا خود درشت» ی زمانی کوردی لە هەردوو حاڵی ڕوون نەبوونەوەی مێژووی زمانەکەمان کارێکی سوودبەخشە، لە سوودبەخشیش پترە چونکە پێویستە: ئەگەر مێژوو ڕوون نەکرایەوە ناچارین دەبێ دەستەو دامەنی ئاخاوتنی ئێستاکەمان بین و لێی بکۆڵینەوە. کە مێژووش ڕوون کرایەوە ئەوساش ماوەیەکی باش بڕدراوە لە ئامادە کردنی دیراسەی پوختەی باری ئێستای زمانی کوردی. لە فەرزی جەمسەری هەندێک لەو

دەستوورانەی کە ئیمرۆ دەدۆزرێنەوە لەگەڵ جەمسەری دەستووره مێژووییەکان یەکتر نەگرنەوە و نەگونجێن، دیسانەوە تەعدیل کردنی دەستوورەکانی نویٚ بۆ گونجاندنیان لەگەڵ هی کۆن ئاسانتر دەبیٚ لەوە کە لە سەرەتاوە دەست بکریٚ بە دانان و دۆزینەوەیان، ڕەنگە بەشێکی زۆریش لەو دەستووره نوێیانە بیٚ تەعدیل کردن ببنە درێژە پێدانێکی ئاسایی و ڕاستەوخۆی دەستووراتی کۆنینە.

وا دەزانم حورمەت گرتنی ئەم ئیحتیمالە زۆر بێهێزەی دۆزینەوەی سەرەتاکانی زمانی کوردی لە پێش سیٚ چوار هەزار ساڵێکەوە، هەر ئەوەندەی لیٚ دەوەشێتەوە کە تازە خستمە ڕوو هەرگیز داوامان لیٚ ناکا دەست پاچە بە دیاربوون و نەبوونیەوە بوەستین تا ڕۆژگارێکی بیٚ بڕانەوە یا خود زۆر دوور و درێژ. وەستانمان زیانێکی سادە و بیٚ تەئویلە لە خۆمان و لە زمانەکەشمانی دەدەین.

ئەم باوەڕەم دەم هاوێتە سەر ڕێبازی خۆش ئامەدی کردن لە هەموو چالاکێکی زمانزانانی کورد بەرەو دۆزینەوەی دەستووره ورد و درشتەکانی زمانی کوردی، فەتوا بۆ خۆشم دەدا کە وا لە گوێرەی دەسەڵاتی خۆم، بە تەنهایی یا خود دەگەڵ خەلقی تر، لەو تەرزە چالاکیەدا دەستێکم هەبیٚ. نەزانراوی و شراوەیی دەستوورەکانی کوردی بە بەریەوە هەیە خەلقێکی زۆر بۆ ماوەیەکی درێژ دەگەڵ خەریک بن و لێی نەبنەوە.

ڕەنگە بگوتریٚ کردنەوەی دەرگەی تۆژینەوەی زمان لە ڕووی هەموو کەسێک قەڵەباڵغێکی بێتام بە دەوری زمانەوە کۆ دەکاتەوە، بەڵام وادەزانم ئەم تێبینییە هەر لە سەر کاغەز بایەخدارە، لە واقیعدا جێی مەترسی لیٚ کردن نییە: جاریٚ لە پێشەوە دەبیٚ بڵێین و بزانین من و تۆ ناتوانین، ڕێشمان نییە، خەلق مەنع کەین لەو چالاکییە هەروەک ناتوانین مەنعیان کەین لە ڕاوەماسی یا خود لە سێباز و شەترەنج. لەوەش بەولاوە هەر کەسە ئۆباڵی بە ئەستۆی

خۆی، کە بێ و خۆ بە زمانەوە یا بە شەترەنجەوە خەریک کا: خەریکبوونی خەلق بە زمان و غەیری زمانەوە چ ئەرکێکی مادی ناخاتە سەر شانی کەس، بە هەڵە چوونیشیان زەرەر لە خۆیان نەبێ نادا چونکە مەرج نییە هەڵەی فلان و فیسار بە لای نووسەرانەوە پەسند بێ و بکرێتە ڕێباز و شێوازی نووسین: نووسەران بە زەحمەت شتی ڕاست لە غەیری خۆیان دەسەلمێنن چ جایی هی چەوت. ئەوەی ڕاستیش بێ نووسین کارێکی ئاسان نییە، ئەگەر بۆخۆی ئاسانیش بێ بڵاو کردنەوەی ئاسان نییە. تۆ کە شتێکت نووسی و لێی بوویەوە جارێ دووچاری گرفتی گەورە نەهاتووی: چاپ کردنی نووسراوەکەت گرفتی ڕاستەقینەیە. دەگەڵ ئەم هەموو زەحمەتەی مادی و زیهنی نووسین، کەم وا یەکێک خاوەن بەهرە نەبێ خۆی لێ بدا.

کەواتە ئازادبوونی نووسەران لە خەریکبوونیان بە زمانەوە هی سڵ لێ کردن نییە. خۆ خەریک کردن بە زمان و دۆزینەوەی دەستوورەکانی هەر لە تاکە ڕێگەییێکەوە تێ ناکا: چەندین لایەن و کەلێن و پەنا و پەسێو هەن لە تێکڕای باسی زمان و زانستەکانی، هەر یەکەیان لەوانەیە عومری مرۆڤ بەسەر ببەن و کۆتاییان نەیێ. بێگومان یەخەگیربوونی سەرلەبەری ئەو سەرەباسانە بە نیسبەت تاکە کەس کارێکە سەری هەیە بەڵام کۆتایی نییە، چونکە بە تەنها لێیان نابێتەوە گریمان دەسەڵات و هێزی نووسینیشی هەبێ لەو هەموو مەیدانانەدا. دۆزینەوە و دانانی دەستوور بۆ سەرتاسەری زمان نە ئیشی تاکە کەسە و نە لە ساڵێک و دووساڵیشدا بە ئەنجام دەگا. خۆ ئەگەر ئەو هەموو زانستانەی زمان تۆمار بکرێن و بە درێژییەوە بخرێتە پەراوێزی کتێبەکەوە ڕەنگە کتێبەکە هێندە قورس بێ هەڵگرتنی وەزەحمەت بکەوێ.

کۆڕی زانیاری کورد ئەو هەموو لایەنانەی گرتۆتە بەرچاو و لە گوێرەی پێداویستیان پلانی کار کردن و تۆژینەوەی بۆ ئەندامان و لێژنەکانی داناوە. پەراوێزی ئەو پلانەی کۆڕ هێندە فرەوانە دەتوانێ هەموو جۆرە زانستێکی زمان بگرێتە ناوەوە هەر لە ئێستاوە هەتا ئەو کاتانەی کۆڕ هەیە و

مەعلووماتی سەر بە زمان، لە کۆن و لە نویێ، خۆ بە دەستەوە دەدا. بە شێوەییێکی دائیمی دوو لیژنەی زمانی لە کاردان و لە وەتەی کۆڕ بنیاد نراوە لیژنەکانی خەریکن و هەر بە ڕێوەن، چ مەعلوومیش نییە کەی لەو فەرمانە دەبنەوە. لە فەرزی گەیشتنە کۆتایی کاری ئێستاکەیان دەشێ لە دواڕۆژێکی نێزیکدا سەرلەنوێ بکەونەوە گەڕ.

من بۆ خۆم لەگەڵ یەکێک لەو لیژنانە بە پێی بەرنامەییێکی لێ هاتوو بۆ تۆژینەوەییێکی پوختە لە شەقامەکانی ڕێزمانی کوردی لە دوو ساڵ زیاترە خەریکم. لیژنەکە مەودایێکی باشی بڕیوە و گەلێک ڕاستی و تایبەتی نهێنی زمانی کوردیشی دۆزیوەتەوە لەوانەی تا ئێستا وەک شرایەوە وا بوون. لەو لێکۆڵینەوانەدا هەوڵ دراوە سەیری ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بکرێ هەر لەبەر تیشکی سروشتی زمانی کوردی خۆی نەک هی زمانانی تر، واتە ویستراوە ڕێزمانی کوردی ئازاد بێ لە تاو و گوڕی دەستووری ئەو زمانانە کە بە هۆی خەریکبوونی زمانزانانی کورد پێیانەوە شاڵاویان هێناوە بۆ ناو زۆربەی ئەو کتێبانە کە لە سەر ڕێزمانی کوردی دانراون.

ئەم لیژنەیە لەگەڵ تێکڕای زمان خەریکە، بەرهەمی لێکۆڵینەوەکانیشی لە ئەنجامدا کتێبێکی گەورە پێک دێنێ، لەو کتێبانەی مەبەستیشی ڕوون دەکەنەوە و خوێنەریش وەڕز ناکەن بە درێژە پێدانی لە عادەت بەدەر. نووسینی ئەم پەڕ ئەو پەڕ لە سەرهەموو باس و لاباسەکانی ڕێزمانی کوردی کارێکی ئاکادێمی نەفەسدرێژی ئەوتۆیە نە لەگەڵ جۆری خەریکبوونی لیژنە ڕێک دەکەوێ نە دەستیش دەدا بۆ خوێندەوارێکی ئاسایی کە هەر هێندیی مەبەستە لە سەر جوملەی دەستووری زمان شارەزا بێ، بە شێوەییێکی مام ناوەنجی، و لە ئەنجامدا بە قەدەر شاگردێکی زانکۆ (جامعە) تێیدا بەڵەد بێ. ئەم تەرزە دیراسەیە کە دەست بدا بۆ خوێنەری ئاسایی، نەک هەر لە کوردی بەڵکوو لە هەموو زمانێکدا بەدی دەکرێ و پێداویستێکی خوێندنەوەی ڕۆژانەی ڕۆشنبیرانە.

تۆژینەوەی ورد و درێژەپێدراو لە پەنا و پەسێو و گۆشە پەنهانەکانی زمان کە لە خۆیانەوە ناکەونە بەر چاو و سرنجی خوێنەری بە پەلە و سەری ڕێ بە هۆشی مرۆڤێک ناگرن خۆی بۆ باسی زمان ئامادە وەیا تەرخان نەکردبێ، ئا ئەم تۆژینەوەیە لە پەراوێزی دیراسەی تێکڕایی و سەرلەبەر و یەک نەفەس جێی نابێتەوە. سەیرێکی بەشی یەکەمی ئەم نووسینە بکەی کە خەریکی ڕۆڵی تاکە یەک پیت (وەیا دەنگ) ی زمانی کوردییە و لەگەڵ درێژەی کە هەیەتی نەی توانیوە هەموو سەر و بەرێکی باسەکە ناوکێڵ بکا، بۆت ئاشکرا دەبێ پێوانی هەموو زمانی کوردی بەم گەز و گرێیە و ڕۆ چوون تێیدا بۆ ئەم قووڵاپیە هەولێکی بێ بڕانەوەی دەوێ، بەرهەمەکەش دەگا بە بارستی «ئینسایکلۆپیدیا».

لە زمانی کوردیدا چەندین کەلێن و قوژبنی نەدیتراوی وا هەیە هیچ کامێکیان ناکەونە ژێر سەرەباسە بەرینەکانی ڕێزمانەوە و لەوانەن کتێبی فێرگەکان هەر خۆیانیان تێ نەگەیەنن، کەچی ئەم وردە جەمسەر و جمگە و باریکەدەمارانە قەڵافەتی زمان دەکەن بە ساختێکی یەکگرتووی تەواو. وا دەبێ مەکینەیێکی زۆر گەورە بە دەرکێشانی یەک دوو برغوو و بزمار هەمووی لەبەر یەک هەڵ دەوەشێ و لە مەکینەیی دەشۆرێ. زمانیش هەر وایە: وردیلە ئەمرازەکانی لەگەڵ قووچاندن و کردنەوەی هەندێ لە پیتەکانی وەیا گوشین و شل کردنی چەند وشەیێکی، گیان دەخەنە بەر ڕستە و گوتە و ئاخاوتنی و دەیانکەن بە هەڵگری واتا و مەبەستی دەروون و مێشکی ئەو کەسە زمانەکە بە کار دێنێ. وەک دەزانین دۆزینەوە و ئاشکرا کردنی ئەم وردە تایبەتییانە و پێکدا دووران و تێک چڕمسانی ناوەکی ئاخاوتن سروشتی ڕاستەقینەی زمان دەردەخەن: دەستووورە بەرچاو و بەرینەکانی زمان مرۆڤ ناگەیەنن بە ناوەڕۆکی، چونکە بە هۆی زێدە بەر چاوییەوە پێویستیان بە سرنج دان و لێ قووڵبوونەوە نییە. کار و بەرکار و کارا و ناو و ئاوەڵکار و ئەمراز... ئەمانە سەرەباسی یەکجار بەرینن، هێندەش بەسەر زارانەوەن هەر دەڵێی گوتنەوەیان بووە بە«تحلیل حال». وا هەیە ئەم سەرەباسە بەرینانە لە بەر زۆر

گوتنەوەیان لە کاتێکی کۆنەوە، شارێیەکی هێندە بەر فرەوانیان لە ڕێزماندا تەخت کردووە، بەربەستی هەوڵ و تەقەڵلای تازە دەکا لە لایەن نووسەری خاوەن ڕای سەربەخۆوە کە ئەمەش بۆ خۆی گرفتێکە و دەبێ چارەسەر بکرێ چونکە لەوانەیە گەلێک لەو دەستوور و شارێیە پەرەسەندووە و باوەڕ پێ کراوانە هەڵەی گەورەیان تێدا بێ هەر نەبێ لەبەر ئەوە کە بە زۆری لە دەستوور و ڕێزمانی بێگانەوە وەرگێڕاون و لێ بێدەنگبوونیان دەبێتە هۆی سەپاندنی هەڵە بە سەر ڕێزمانی کوردی یەوە.

لەم تێبینییانەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم و پێتی بسەلمێنم کە وا خەریکبوونی من و غەیری منیش بە باسی درێژە پێ دراو لە تاکەکانی مەوزووعی ڕێزمان ئەرکێکی پێویست و ناچارییە هەر دەبێ ئەنجام بدرێ. گریمان سەرڕشتەی زمانی کوردی هەڵ کرایەوە، وەک کەلافەی دەزوو، تا ئاڤێستا و پێش ئاڤێستاش وەیا خود هەر تا دەورانی ساسانی وەیا بەم لاوەتر بە دوا دەستاندا هات، ئەم کارەی شی کردنەوەی زمان و خورد کردنەوەی باسە گەورەکانی نە پشت گوێ دەخرێ، نە بایەخی کەم دەبێتەوە نە ئەنجام دانیشی چ زیانێک بە هەوڵ و تەقەڵلای کەس دەگەیەنێ. وردبوونەوە لە ناوەڕۆکی زمانەکەمان تا ئەو ڕادەیە کە گەڕ و سووڕی میکانیزمی دەروونی زمانەکە دیار دەخا فەرمانی سەرشانی زمانزانانی کوردە. لە گەلێک هەڵوەستی نازکدا هەست دەکرێ بە زێدە پێویستبوونی بە کار هێنانی ئەو پەڕی پسپۆڕی و شارەزایی لە هەرچی پێی دەگوترێ «فقە– فیلۆلۆجی»، ئەوساش ڕەنگە قەناعەت پەیدا کردنی بێکەلەبەر کارێکی سەخت بێ.

دەڵێن خڵتەی ژێر دەریا مێژووی ملیۆنەها ساڵی ڕووداوەکانی فیزیایی و سروشتی زەویت بۆ دەگێڕنەوە گوتەیەکی ڕاستە چونکە هەر زەڕڕەیەک لەو خڵتەیە کە لە دەرەوەی دەریاکەوە سەرەوژێر بۆتەوە بۆ تەختی بنی، بە خۆی و حیکایەتی ئەو ڕووداوەی کە سەرەوژێری کردۆتەوە چوە بۆ بنی دەریا. حیکایەتەکەی لە دەرەوە بەجێ نەهێشتووە. وردە تایبەتییەکانی زمانیش وەک

زەڕڕەی ئەو خڵتەیە وایە، ئەویش لە بنەڕەتدا زادەی ڕۆژگارێکی دێرین و واقیعێکی تێپەڕیوە بە هەموو کەین و بەین و سەر و بەرێکیەوە، کە بە لێژگەی مێژووشدا سەرەو خوار بۆوە تا ڕۆژانی ئێستاکە ڕەنگ و دەنگێکی زۆری ئەو ڕابردووەی لەگەڵ خۆی هێناوە بە دیاری بۆمان. ئەگەر شارەزای زمان چاوێکی زەڕڕەبین و هەستێکی مووقلاشی هەبێ لەوانەیە گەلێک لە ڕەنگ و دەنگی ئەو دیارییە کۆنە تەرجەمە بکا بۆ سەر ئاخافتن و ڕاوێژی ئێستاکەمان. زمانزانێکی ئاسایی کە چاو و هەستی زەڕڕەبین و مووقلاشیشی نەبێ دەتوانێ لە ڕێی وردبینی و قووڵبوونەوەی خۆی بە ناو شیرازەی داوە باریکەکانی زماندا شوێنپێ خۆش کا بۆ گەشتی سەرەوژوورتر بەرەو بنج و سەرچاوە کۆنەکانەوە، هەرچەند بۆ خۆی لەو بنج و سەرچاوانە زۆریش باخەبەر نەبێ. لێرەدا بە نموونە دەڵێم یەکێک لەو مامۆستایانەی بە زمانەوە خەریکبوون، لە ئاست چەند فیعلێکی وەک «چاندی، ستاندی» لە سەر سوڕمان بەولاوە شتێکی بە دەستەوە نەبوو چونکە ئەو فیعلانە لەو جۆرەن کە بە هۆی ئەمرازی «اندن» ـەوە بوون بە تێپەڕ (متعدی) دەوجا کە ئەمرازەکەت لە فیعلەکە وەرگرتەوە چی ئەوتۆی لێ نامێنێتەوە پێی بگوترێ فیعلی «تێنەپەڕ». تۆ ئەگەر لە «چاندن» ئەمرازەکەی «اندن» ت لابرد دەمێنێتەوە تاکە پیتی «چ» کە ئەمە دەست نادا ببێتە فیعل. خۆ و تالع من بە هۆی پەیوەندیمەوە لەگەڵ هەندێ عەشرەتەکانمان ئاگاداری بنجی ئەو دوو فیعلانە بووم، بنجەکانیان تا ئێستاش لە نێوان ئەو عەشرەتانەدا بە کار دێن: دەڵێن «تووتنەکە چنا، زەویەکە چنا» لە ئایندە (مضارع) دا دەڵێن: «تۆ بڵێی تا دوو ڕۆژی تر ئەم پەڵە زەویەم بۆ بچنێ؟» هەروەها دەگوترێ «هەقەکە بە تەواوی ستنا - ئەم هەقە بە کەس ناستنێ». خولاسە لەو مامۆستایەم گەیاند کە »چاندن و ستاندن» لە دوو فیعلی «چنان و ستنان» ـەوە هاتوون، وا دیارە بۆ مەبەستی سووک کردنەوە پیتی «ن» لە سیغەی تێپەڕدا بە هۆی «اندن» ەوە سواوە و لە جیاتی بگوترێ «چناندی و ستناندی»، کە ئەمە ڕاستی فیعلەکەیە، دەگوترێ «چاندی و ستاندی». بە

نیسبەت مامۆستاکەوە دوو گرێی گرنگ لە تۆژینەوەیدا کرایەوە، بەڵام تا ئێستاش بە نیسبەت ئەو و منیشەوە گرێ فیعلی «مان» کە وا لە ئایندەدا دەبێتە »دەمێنێ» نەکراوەتەوە چونکە بە پێی دەستووری دارشتن و وەرگرتنی فیعلی ئایندە لە ڕابردووەوە دەبوو فیعلی «ما» لە ئایندەدا ببێتە «دەمێ»، سیغەی «دەمێنێ» تێپەڕە نەک تێنەپەڕ و دەبوو لە ڕابردوودا »ماندی» بێ وەک کە دەڵێی «سووتاندی- دەسووتێنێ، ڕژاندی- دەڕژێنێ». دەوجا لێرەدا بە نیسبەت «ما- دەمێنێ» دوو پرسیاری بێ وەرام دێنە پێشەوە: یەکەم : دەبێ ئەسڵی «ما» چی بووبێ و چی لێ قرتابێ؟ دوەم: چۆن وابوو سیغەی تێپەڕ (متعدی) بۆ تێنەپەڕ (لازم) بەکار بێت؟

کە زۆر ورد بینەوە دەتوانین ئەم پرسیارەش بکەین و بڵێین: بە عادەتی دەستووری فیعلی ڕوودان (مطاوعە) ی وەک «ڕژا- دەڕژێ، سووتا- دەسووتێ» لە سیغەی تاکی یەکەم (مفرد متکلم) و هەموو کەسەکانی تردا ئەم «ێ» ەی کەسی سێیەمی تاک هەر دەمێنێ و ناپەڕێ. دەگوترێ «دەڕژێم، دەسووتێنم - دەرژێن، دەسووتێن» کەچی لە هی «مان» دا ئەم «ێ» یە بۆ کەسەکانی غەیری سێیەمی تاک نامێنێتەوە. دەڵێی «دەمێنم، دەمێنن» کەچی دەبوا بگوترێ «دەمێنێم، دەمێنێن» ئاخۆ ئەم جوداوازییە چییە و لە کوێوە هاتووە؟ تۆ بڵێی لە بنەڕەتدا «ماندن» نەبووبێ کە ئێستاش لە فارسیدا هەروا بە کار دێت؟ ئەگەر قەناعەت بێنین کەوا «ماندن» سواوە و بوە بە «مان» گرێیەکان لە خۆوە دەکرێنەوە و سیغەی ئایندە «مضارع» ی دەبێتەوە خزمی سیغەی ڕابردووی و گەردانی (تصریف) بەم جۆرە دەبێ:

- من ماندم – من دەمێنم
- تۆ ماندیت – تۆ دەمێنیت
- ئەو ماند – ئەو دەمێنێت
- ئێمە ماندین – ئێمە دەمێنین
- ئێوە ماندن– ئەوان ماندن – دەمێنن

ئەوسا سەیریش لەوەدا نامێنێ کە «ی» کەسی سێیەمی تاک لە »مضارع» دا بۆ کەسی یەکەم و دوەم و هەموو کەسەکانی تر خۆ بەدەر ناخاتەوە چونکە ڕاستەوخۆ وەک فیعلی «مرد» حیسابی دەگەڵدا دەکرێ بێ زیاد و کەم :

- ئەو مرد - ئەو دەمرێت
- من مردم - من دەمرم
- ئێوە مردن - ئێوە دەمرن
- ئەوان مردن - ئەوان دەمرن

دەبینی لێرەشدا «ی» کە نابێتەوە بۆ کەسی یەکەم و دوەم، تەنانەت بۆ سێیەمی کۆش هەر نایێتەوە. لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا باسی فیعلی «مرد» و نەبوونی بە «ڕووداو- مطاوعە» دەخوێنێتەوە، چی دەربارەی «مرد» گوتراوە سەر لە بەری دەشێ دەربارەی «مان- ماندن» بگوترێتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ فیعلی «مان- ماندن» لە نوقتەی بەرامبەری «مردن» ەوە دەوەستێ، واتای ئەو پێچەوانە دەکاتەوە، دەگوترێ «فڵانەکەس ماوە یا مردووە؟» ئەمە فەرقێکی نییە لەگەڵ ئەوەدا کە بگوترێ «ماوە یا نەماوە؟».

ئەم نموونەیەی لێرەدا خرایە بەر چاو بە خۆی و درێژەیەوە، لە سوود بەولاوە تێیدا نییە بۆ زمانزان و تێکڕای باسی زمان چ لە لایەن مێژووی زمانەوە بێ چ لە لایەن ڕێزمان و دەستوورەکانیەوە بێ. بێ زیانی لە باسی وەهادا ناگۆڕێ بە زیان ئەگەر باسەکە نیشانیشی نەپێکابێ چونکە توانای نییە بە خۆی و هەڵەیەوە بە سەر خەڵکدا بسەپێ. دۆزینەوەی هەڵەبوونی، شتێک نییە لە بەر چاوی دەیان و سەدان زمانزانی کورد خۆ بشارێتەوە. لە حاڵێکدا باسەکە بە هەڵەش چووبێ دوو سوودی گەورەی هەر تێدا دەبێ: سوودی یەکەم لەوە دایە زیهنی زمانزانان بۆ هەندێ ڕێباز و پەنا و پەسێوی زمانی کوردی دەبا کە نیگای تایبەتی خاوەنەکەی بۆیان چووە و لەوانەیە زیهنی یەکێکی تر لە خۆوە بۆیان نەچێ. تۆ سەیری «کریستۆف کۆلۆمب»، بەرەو ڕۆژاوا کە نیشتە

دەریای ئەتلانتیک بەو ئومێدە بوو لەوێوە بگا بە هیندستان، هەر لەو باوەڕەوە بوو ناوی هەندێ جەزیرەی نا »جەزیرەکانی هیندستانی ڕۆژئاوا» چونکە وای دەزانی گەیشتۆتە هیندستان نە ئەرزێکی تر. هەڵەی کریستۆف کۆلۆمب نەیتوانی زاناکانی جوغرافیا بە هەڵە ببا و زوو زانیان ئەم زەوییە دۆزرایەوەیە وڵاتێکی سەربەخۆیە و چ پەیوەندی نییە لەگەڵ هیندستاندا.

سوودی دووەم لەوەدایە، تۆژینەوەی شارەزایانە ئەگەر ئەنجامی بێ هەڵەشی بە دەستەوە نەدا تیشک داوێژێ بە دەوری خۆیدا و بە بەریەوە هەیە ڕاستە شەقامان ڕوون کاتەوە و شوێن هەنگاوی خەڵقی تر ئاشکرا بکا. بە نموونە دەڵێم فەلەکناسانی یۆنان کە گوتیان ڕۆژ سێسەد هێندی زەوی گەورەیە و لەو گوتەیەدا چوار هەزار جار بە سەهوو چووبوون دیسانەوە زیهنی خەڵقی سەردەمی خۆیان و دوا خۆیانیشیان بۆ ئەو ڕاستییە برد کە ڕۆژ لە زەوی گەورەترە بە پێچەوانەی ڕواڵەتی بەرچاو.

نووسینێکی شارەزایانە تا دەگا بەو شوێنە کە ئەنجامی هەڵە بە دەستەوە بدا زۆر وردە تێبینی و سرنجی ڕاستی دەربڕیوە کە تێکڕایان دەبنە سامانێکی تازە داهاتووی ئەو باسە. لە تەجرەبەی خۆم وا بووە ئەوەندە سوودی پێم گەیشتووە لە خوێندنەوەی گوتارێکی ئەوتۆ کە لەگەڵ لێکدانەوە و ئەنجامەکانی ڕێک نەکەوتووم زۆر زیاتر بووە لەو سوودە کە لە گوتارێکی سافیلکەی بێ قووڵایی کەم بڕشتم وەرگرتووە هەرچەند لەگەڵ باوەڕی خۆشم گونجاوە، چونکە وردی و قووڵایی و شارەزایی گوتارەکەی یەکەم چەندین دەرگەی بە ڕوومدا کردۆتەوە بۆ ناو ناوەڕۆکی مەوزووعی پڕ گرفت و گرێ و گاڵ کە ئەگەر ئەو نووسینە نەبا ڕەنگ بوو بە زەحمەت یا خود بە درەنگەوە بۆم کرابانەوە، لەوانەش بوو هەر نەکرێنەوە.

خوێندنەوەی نووسینی ورد و قووڵ سەرەڕای وەدەست هێنانی زانیاری تازە بابەت و نهێنی، گەشتێکی خۆشکەڵەش دەکا بە زیهنی خوێنەر، دەست لە ناو

دەستی نووسەر، بە ناو ئەو دەربوونە پێچەڵپێچانەدا کە زیهنی نووسەرەکە بە چرای تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی خۆی ڕوونی کردوونەوە. گەشتی ڕاستە شەقامان کە درێژەی کێشا، بە هۆی یەکئاهەنگییەوە (رتابە)، بیری گەشتەوەر کول دەکا و ڕایدێنێ بە ڕەوتی بێگرفت لە ڕێبازی هەمواردا ئیتر کە هەنگاوی هەڵێنا لە ناو ڕێچکۆڵەی تەسک و بەرداویدا یا خود درک و دار و خلیسک و هەوراز و نشێوی هاتە پێش خێرا ماندوو دەبێ و توانای بزووتنەوەی نامێنێ. خوێندنەوەی نووسینی ورد و بە هێز و پێز بۆ ناو قووڵایی بابەت وەرزش بە مێشک دەکا و زاخاوی زیهن دەدا، با بڵێم تیغی زەکاوەتی خوێنەر دەمەزەرد دەکاتەوە. وەک لێتەوە دیاریشە ژیان و بەرەو پێش چوونی، ساڵەو ساڵ لە زەحمەتی و سەختی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی و زانستی زیاد دەکا. هەر بابایە و شیعر و پەیکەر و ڕەسمی نامەفهوومتر دێنێتە کایەوە و دەشڵێ «فەن بۆ گەل نەک بۆ فەن». وەنیە من چ ڕەخنەیێکم هەبێ لە جۆری «سازدان و بەرهەم هێنان» کە هونەرمەند وەیا نووسەر پەسندی دەکا، تەنها لەوەدا ئیعتیرازم هەیە کە تیجارەت بە ناوی «گەل» ەوە بکرێت.

بەرهەمێک کە بە جۆری سەخت و نامەفهووم دەروونی خاوەنەکەی تەرجەمە کرد لەوە دەردەچێ بۆ گەل بێ یا بۆ گەل نەبێ و دەبێ پێی بگوترێ «فەن بە ڕاستی» بەو مانایە کە هونەرمەند نەخشەی هەست و تاسەی خۆی کێشاوە بە بێ فێڵ و بەو شێوازەی کە تێیدا پسپۆڕە، گەل تێی بگا یا تێینەگا. چ کەس گوناهبار نییە لەوەدا ئەم جیهانە پڕە لە پرسیاری سەخت و سەرکەش، زانستەکانیش چ تاوانێکیان نییە کە من و تۆ تێیان نەگەین. سروشت بە هەموو بارێکیەوە و لە هەموو ڕوێکەوە مەتەلاوی و هەزار تۆژاڵە. ئەوەی دەیەوێ تێی بگا دەبێ خۆ ماندوو کا و خەریکی تێگەیشتنی بێ: ژیان و گۆڕان و بەرەو پێشچوون لە بەر خاتری من و تۆ خۆ سادە و تەنک و بێ بارست و قووڵایی ناکەن تا تێیان بگەین، کە ئەمە بکەن دژی خۆیان ڕەفتار دەکەن. دەبێ من و تۆ لە تین و تاو و زیرەکی و تێگەیشتنی خۆمان زیاد کەین تاکوو لەگەڵ ژیان جووت بڕۆین، گوتەی «بۆ گەل» نابێ بکرێتە

لەمپەڕ و بەرهەڵست لە بەر هەنگاوی گەلەکە خۆی. دەبێ کارێک بکرێ گەل لە بەرهەمی سەخت بگا ئەو بەرهەمە لە ئەدەبدا بێ یا لە زانست یا لە هونەر. زمانیش یەکێکە لەو باسانە کەوا باری زەحمەت و لایەنی ورد و خەیاڵی ورد و تێکەڵ و گرێیاوی و تێک هەڵکێش بڕوا زمانیش ئامادەیە لەو گێرەیە دەستوور و ڕێباز و ڕچەی باریک گەوەک و تێک ئاڵقاو بخولقێنێ بۆ ئەوە بتوانێ هەست و نەستی هۆش و دەروونی مرۆڤ دەربڕێ. بەولای دەربڕینی واتاکانی دەروونی مرۆڤەوە،

زمان ناچاری دەربڕینی ئەو واتا و مەبەستانەیشە کە لە ڕێبازی تەجرەبە و زانستەکانی «تطبیقی و پیشەسازی» بەوە ڕۆژ بە ڕۆژ لە پتر بووندان، ئەم کارەیش ئیمڕۆ و دوێنێ بەرەنگاری نەبووە: لەوەتەی مرۆڤ بووە بە خاوەن هۆش و تێگەیشتن و تەجرەبە و زانست و هونەر و پیشە، ئەرکی زمان و ئاخاوتنی بەرەو زەحمەتتری و گرانترییەوە ڕۆییوە و هەر لە ڕۆیشتندایە.
هەڵبەت ئەم حاڵەی بەردەوامبوونی سەرەو ژوور چوون و ورد و قووڵبوونەوەی بەرهەمەکانی«عقلی و تطبیقی» مرۆڤ بە درێژایی کات داوای لە زمان کردووە کە ئەویش لە هەموو ڕوێکەوە بەرەو ژوور بچێ و ورد و قووڵ بێتەوە دەنا لە ڕەوتی «هۆش و کردەوە» ی مرۆڤ دادەما و بە مەدا مرۆڤ خۆی پەکی بەرەوپێش چوونی دەکەوت چونکە کە زمانی ئاخاوتن و تۆمار کردنی دابڕا لە تیژڕۆیی هۆش و جوانکاری دەستەکانی، کە ڕستە و ئەمرازی پاراستن و بیر هاتنەوە و تێگەیاندنی ئەو جوانکارییەی لە دەست دەچوو... مرۆڤ کە زمانی نەیتوانی ببێ بە تەرجوومانی بیر و کردەوەی، وردە وردە دەبێتە گیانلەبەرێکی «نەزۆکی عەقڵی» و کانیاوی ئیلهامی وشک دەبێ و پەکی جوانکاریی «ابداع» ی دەکەوێ، و چونکە بلیمەتی و زانایی و زیرەکی و ئامادەیی مرۆڤ بۆ داهێنانی واتای تازە و بەرهەمی نۆژەن و کردنەوەی دەرگە داخراوەکانی سروشت بە هۆی لە یەکتر گەیشتن و بە یەکتر گۆڕینەوە و هاریکاری تاکەکانیەوە دەبێ: تاکە مرۆڤ ناتوانێ کانیاوی بێبن لە دەروونی خۆیدا هەڵقوڵێنێ و وشکایی نەبێ. بە تێک کردنەوەی جۆگە

و شەلەگە و چاویلکەی بیر و هۆشی میلیۆنەها تاکەکانی مرۆڤ بۆ ماوەی کاتی بێ ژانەوە ئەم زانست و ژیار (حضارە) و هونەر و تێکڕای بەرهەمی «هۆش و کردەوە» ی ئادەمزاد پەیدا بووە. شیرازەی بە یەکەوەبەستنەوە و بە یەک گەیشتن و تێک گەیشتن و هاریکاری و هەرەوەز و هەموو چالاکیەکی کۆمەڵایەتی مرۆڤیش زمان و ئاخافتن بووە. هەڵبەت لە بیرمانە ئاخافتن خۆی دەبێتەوە «نووسین»، واتە نابێ خەیاڵ بۆ هێندێ بڕوا کەوا ڕەنگ بوو نووسین جێی ئاخافتن بگرێتەوە ئەگەر ئادەمزاد نەگەیشتبا بە داهێنانی ئاخافتن.

هەرچەند بمانەوێ ئیسپاتی ئەوە بکەین کە «پێویستی» و داخوازیەکانی ئابووری و گوزەران مرۆڤی خستۆتە سەر ڕێبازی گۆڕان و پێشکەوتن، هەرگیز ناتوانین ئەو گۆڕان و پێشکەوتنە لە قەرزی زمان و ئاخافتن ڕزگار بکەین. هۆی بەرەوپێش چوونی مرۆڤ ئابووری بێ یا غەیری ئابووری، ئەو ڕاستییە هەر دەمێنێ کە وا لە گوێرەی پێشکەوتن و ئاڵۆزانی باری ژیان زمانیش بەرەوپێش چووە و دەستوورەکانی تێک ئاڵاون: بەو پێیە، زمان و ئاخاوتنی پلەی شوانکارەیی ناتوانێ ئەرکەکانی پلەی زانست و تەکنیک هەڵگرێ و فەرمانەکانیان جێبەجێ بکا، زاتەن زمانیش لە پلەی شوانکارەیی نەوەستاوە لە حاڵێکدا مرۆڤ گەیشتبێتە زانست و تەکنیک. هەرگیز نەدەکرا و نەدەشیا کۆمەڵایەتی مرۆڤ لە ڕێبازی گۆڕانی «مادی» دا بگا بە ئاسمانگەردی کەچی ئاخاوتنی هەر ئەوە با کە لە قۆناغی ئاژەڵ لەوەڕاندندا هەبوو. تۆ لە لای خۆتەوە بەراوردێکی نووسینی کوردی بەر لە 50 ساڵ بکە لەگەڵ هی ئێستاکەیدا، خۆ کورد جارێ لە باری «مادی» یەوە چ قۆناغێکی ئەوتۆی نەبڕیوە ژیانی 50 ساڵ لەمەوبەری لێبێتەوە بێگانە کەچی نووسینەکەی هێندە گۆڕاوە و بەرەوپێش چووە هەر دەڵێی پەیوەندی خۆی پچڕیوە لەگەڵ ئەو ڕابردووە نێزیکەیدا (لەم گوتەیەدا تەنها مەبەست شێوازی نووسینە نەک ئاخاوتن). بێگومان گۆڕان و بەرەوپێش چوونی نووسینی کوردی کە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و «مادی» یەوە سەری هەڵنەداوە، بە هۆی وەرگرتنی زانست و

ڕۆشنبیری نوێوە بووە کە وا بە حازر و بزری و بێ پەک کەوتن لە سەر «گۆڕانی کۆمەڵایەتی» لە جیهانی پێشکەوتووە بۆی هاتووە. هەڵبەت من نامەوێ بڵێم چ گۆڕانێکی مادی و کۆمەڵایەتی لە نێوان کورددا پێک نەهاتووە چونکە دیارە گوتەی وەها بێ بایەخ و بنجە، بەڵام چ گومانیش نییە لەوەدا بەرەوپێش چوونی نووسینی کوردی لە ڕێبازی خوێندنەوە و ڕۆشنبیری نەوباوی ئەورووپاوە چ خزمایەتێکی نییە لەگەڵ ئەو هێندە پێشکەوتنەی کە چاوەڕوان دەکرێ لەو کەمە گۆڕانە مادی و کۆمەڵایەتییە ڕەسەنە کە لە کوردستاندا پەیدا بووە.

زمان چونکە تەرجومانی هۆش و دەروونی مرۆڤە هەوڵ دەدا، لێشی دەوەشێتەوە، بگا بەو پلەیە کە هۆش و دەروون پێی گەییوە تا بتوانێ مەبەستەکانیان دەربڕێ دەوجا چ فەرقێک نییە بە لای زمانەوە لەوەدا هۆشی مرۆڤ لە ڕێی گۆڕانی مادی و کۆمەڵایەتییەوە گەیشتبێتە پلەیێکی هەوراز یا خود لە ڕێی خوێندەواری و ڕۆشنبیری مێوان و تەرجەمە کرایەوە، کە وا بە ئەسڵ لە واقیعێکی پێشکەوتووەوە سەری هەڵداوە. بۆ خۆت دەبینی زمانی کوردی، وەک هەموو زمانێکی تر، چەند بە خێرایی پێش دەکەوێ لە مەیدانەکانی «نظری» دا بە هۆی «ممارسە» ی بیر و باوەڕی ئەو مەیدانە «نظری» یانەوە، کەچی چ هەنگاوێک بەرەوپێش نەچووە لە دانانی ناوی تازە داهاتوودا بۆ هەزاران ئەمراز و ڕشتە و پارچەی جودا جودای دروست کراوێکی وەک فڕۆک. تۆ بڵەی کەی دەتوانین بە کوردی باسی «کۆمپیوتەر» بکەین بە خۆی و ناوەڕۆکە قەڵەباڵغ و پڕ لە ئەمرازەکەیەوە هەر وەک باسی مێژوو و فەلسەفە و تیۆریەکانی سەر بە کۆمەڵایەتیەوە دەکەین؟ تا ئێستا چەندین زاراوەی جودا جودا بۆ باسەکان و بەشەکانی ڕێزمانی کوردی کەوتوونە سەر زار و ناو نووسینەوە تا وا بووە یەک عینوان دوو سێ زاراوەی بۆ دانراوە وەک وشەکانی «فرمان، کار، کردار...» کە وا بۆ زاراوی verb، «فعل» بەکار دێن.

پوختەی قسە ئەمەیە، لەگەڵ بەرەوپێش چوونی ژیان بە هەر دوو باری مادی و نامادییەوە زمانیش لە خۆوە بەرەوپێش دەچێ و لە گوێرەی ئاڵۆزان و وەزەحمەت کەوتنی ئەو مەوزووعانەش کە زمان لێیان دەدوێ، ئاخاوتن بەرەو زەحمەتتربوون و وردتر و قووڵتربوونەوە دەڕوا کە ئەمەش بەرهەمێکی کوتومت و ناچاری گۆڕانی ژیان و زۆربوونی گرفتەکانیەتی. لەمەشدا زمان سەختی و زەحمەتی نوێ دەخاتە سەر سەختی و زەحمەتی کۆن کە لە بنەڕەتدا تایبەتی و سروشتی ئاخاوتنە بە هۆی ئەوەوە کە تەرجوومانی هۆش و چالاکیە پڕ لە تێک هەڵکێشان و ئاڵقاندن و ڕایەڵی باریک و وردیەتی.

سرنجێکی سەرپێیی لە زمانە پێشکەوتووەکانی جیهان دیمەنێکی سەرسووڕهێن دێنێتە بەر چاوی بینەر لەوەدا کە باس و دیراسە و لێکۆڵینەوە لەم زمانانەدا هێندە زۆر بووە بە سەر یەکتردا کەڵەکەیان کردووە و مرۆڤ پێڕاناگا سەرە باسەکانیان بخوێنێـەوە چ جایی هەموو کتێبەکانیان. لەگەڵ ئەمەشدا نووسین لە سەر بابەتی linguistics ڕۆژ بە ڕۆژ لە پتربوون دایە. لەوەش سەیرتر: تا ئێستا بیر و باوەڕی زمانزانەکان دەربارەی زۆربەی ئەو باسانە کە لێیانەوە دەدوێن یەکتر ناگرنەوە. وا دەبێ زمانزان بۆ خۆی باوەڕگۆڕی دەکا و سبەینێ نووسینی ئیمڕۆی دەسڕێتەوە. تاکە وشەی linguistics چەندین تەعریفی جودای بۆ دانراوە. سەیرێکی کتێبی What is Llinguistics لە دانانی David Crystal بکەیت دەبینی لە چەند سەرچاوەیەکی گرینگی زانستەوە نموونەی جوداوازی ئەو تەعریفانەت بۆ دێنێ و بەدوا ئەوەدا نارەزایی خۆیشی دەردەبڕێ لە ئاست هەموویاندا. زمانی عەرەبی کە وا لە ماوەی پتر لە 1200 ساڵ پێش ئێستاوە تا ئیمڕۆ لە سەر فەرهەنگ و «فقە» و ڕێزمان و هەموو بارێکیەوە دەریا دەریای کتێب دانراوە هێشتان ئەوەندە لێڵایی و گرفتی تێدا ماوەتەوە کە نووسەرانی ئیمڕۆی عەرەبی، وەک »طبری و کوفی» یەکانی کۆن، لە میانی خۆیاندا دەتوانن ڕێک کەون لە سەر گرتنە بەری تاکە ڕێگەیەک و باوەڕێکی یەکگرتوو لە ڕێزمان بە تایبەتی و لە سەر جوملەی باسەکانی زمان بە تێکڕایی.

بێگومان حاڵی زمانێکی خزمەت نەکراوی وەک کوردی گەلێک زیاتر لەو زمانە خزمەت کراوانە جوداوازی بیر و باوەڕ هەڵدەگرێ، چونکە ئەگەر لەو زمانانەدا ڕێک کەوتن پەیدابوونی لە سەر هەندێ باسەکانیان بە هۆی زۆر لێ دوان و جێوانەوە و دەمەتەقە و ڕاست کردنەوە و لێکۆڵینەوە، لە کوردیدا هێشتان چی ئەوتۆ لە سەرەباسەکانی قەرارداده نەبووە بە جۆرێکی وەها کە لە دەمەتەقەی هەڵاوێرێ. بە نموونە دەڵێم یەکێک ئارەزوو بکا دەتوانێ «کارا و جێگری کارا- فاعل و نائب فاعل» بخاتە ژێر عینوانێکەوە و دەشتوانێ بۆ هەر یەکەیان ناو و عینوانێکی سەربەخۆ دانێ لە ڕێزماندا.

تۆمار کردنی بیر و باوەڕ و بڵاو کردنەوەی بە نێوان ڕۆشنبیر و خاوەن بیر و باوەڕاندا سەرەڕای ئەو سوودانەی تا ئێستا لێی دواین، سوودی تریشی لەوانەی پشت گوێ ناخرێن: زیهنی خاوەن بیر و فەلسەفە ڕێکۆردەر نییە بتوانێ بۆ ماوەیێکی بێ کۆتایی هەڵیانگرێ و بیانپارێزێ، کە تۆماری نەکردن وردەوردە لە یادیان دەکا. جا ئەگەر شتی بە نرخیان تێدا بێ لە کیس خۆی و خەڵقەکەش دەچێ. تۆ کە ئێستا شتێکت نووسی و لە فۆتانت پاراست[2]، سبەی ڕۆژ خۆت و نووسەرانی تریش دەتوانن لێی زیاد کەن وەیا خود هەڵەکانی ڕاست کەنەوە، واش دەبێ هەندێ تێبینی ورد و قووڵ لە نووسینەکەت ببێتە ڕووناکی کە تاریکایی شوێنی تر لە نووسیناندا بڕەوێنێتەوە. تۆ پێم بڵێ کام مەیدانی ڕۆشنبیری کورد گەشتی نیوەچڵی تێدا کراوە تاکوو لە ڕێی خۆ دابین کردن بە «قەناعەت» ەوە یەخەی بەردەین و بڵێین چی تری پێناوێ؟ سەرەباسە زلەکانی ڕۆشنبیری «کوردناسی» بە مێژوو و ئەدەب و زمان و کۆمەڵایەتی و هونەر و فۆلکلۆریەوە، هیچ کامێکیان لە بەرکوڵێک پتر لێیان ئامادە نەکراوە، تێیاندا هەیە کەس لە بەرکوڵیشی نەخواردووە. کە دەڵێم «بەرکوڵ» ئەوەت لە بیر نەچێ قازانی چێشتەکە گەلێک لە قازانی عادەتی زلترە.

کارێکی زۆر پیرۆزی نووسین، بە نیسبەت تێکڕای بزووتنەوە و ڕاپەڕینی ڕۆشنبیری کوردەوە، لەوەدایە تۆڵەی بێنووسینی لێرە بە پێشەوەمان دەکەینەوە و جیلەکانی دوا خۆمان لە سەرسووڕمانی وەک ئێستاکەمان ڕزگار دەکەین هەر نەبێ لە عاست ئەم ساڵانەی ئێمەی تێدا دەژین. چەندین کەس لە کوردان خەریکن پەڕە شڕی کۆنە کتێبەکانی پەنا و پەسێوی مزگەوت و تەکیە و مەزارەکان ئەم دیو ئەو دیو دەکەن بەڵکوو، خوا و ڕاستان، لە دێڕێکدا یا خود لە وشەیەکدا هەواڵێکی پێش خۆمان بۆ دەردەست بکرێ وەیا خود نیوە ئیشارەیەک بۆ ڕووداو وەیا زانست وەیا هەر شتێکی تری سەر بە کوردایەتییەوە بێ لە بن بێژنگی تۆژینەوەدا بمێنێتەوە و سوودێکی لێوەربگیرێ، لە بەشێکی ئایندەی نووسینم لە سەر حاجی قادری کۆیی دەخوێنیەوە چ موژدەیەکی گیان بووژینەوەم لە چەند دێڕێکی «مەلای ئیبنو ئادەم» ـەوە وەرگرت کە لە ساڵی 1205 ی کۆچیدا بە پێی داخوازی جێگە چەند جاران ناوی کورد و کوردی و کوردستان دێنێ... «سلیمانیه» بە «مقر سلطنه کردستان» دادەنێ و ئەو کەسانەی کە عەیب دەگرن لە نووسینی کوردی دەیانخاتە ژێر مەفهوومی ئەو پەندی کوردییەوە کە دەڵێ «وەک هێلکە لە توێکڵی خۆی دەرچووە».

نووسین، بێ زیاد و کەم، دەر کردنی تەزکەرەی نفوسە بۆ ئەو ڕۆژگارە کە نووسینەکەی تێدا دەکرێ. ڕۆژگارێک کە وا بەر نووسین و تۆمار کردن نەکەوتبێ «زێدنامە» (شهادەالجنسیه) نییە و ناناسرێتەوە. حاڵی زمانیش وەک حاڵی تێکڕای ئەو بابەتانەیە کە لەوانەن لە سەریان بنووسرێ. پەنجا ساڵێک دوای ئیمڕۆ کە وا حاجی قادر گوتەنی«ئێمە دەمرین و دەبینە خاکی سەرەڕێ» و جوامێرێکی کوردی ئەوسا خەڵەت و پەڵەت و ڕاست و دروستی نووسینی ئەم ڕۆژگارەمان دەخوێنێتەوە و بەراوردێکی دەکا لەگەڵ بێنووسینی لێرە بەپێشەوە، چەندێکی لێویشی هەڵقرچێنێ لە خەڵەتەکان، درووردێک هەر دەنێرێ بۆ گیانی نووسەرەکان، بە دوا درووددا لێی

دەوەشێتەوە بشسەلمێنێ کە وا بەشێکی نیشانە پێکانی خۆی قەرزداری ئەم خەڵەت و پەڵەتانەیە.

بە دوا خوێندنەوەی سەر لەبەری ئەم تێبینییانە لێت چاوەنۆڕ دەکەم، ئەی خوێنەری کوردی عاشقە زمان، خۆش ئامەدی بکەیت لە زۆربوونی نووسین و لێکدانەوەی زمانزانانە وەتەنگیش نەیەیت لە درێژەکێشان و وردکاری ئەو نووسینانە. بایەخ دانی کۆڕ بەم تەرزە بەراوردی و تۆژینەوە و سرنج گرتنی قووڵ و نەفەس درێژ کە لەم نیمچە کتێبەدا دێتە بەر چاوت لە سەر جوملەی تێبینی و ڕوون کردنەوەی ناو ئەم پێشەکییەوە هاتووە، منیش بە هەمان ڕێبازدا بۆ هەڵگرتنی ئەرکی ئەم نووسینانە ڕۆیشتووم بەو نیازە خزمەتێکی تێر و پڕی ڕێزمانی کوردی بکرێت، لەویشەوە هی تێکڕای ڕۆشنبیری کورد[3].

## بەشی یەکەم

## بەکارهێنانی «ی» لە زمانی کوردیدا

- وەشانی یەکەم :گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم ساڵی1974

زمان وەک نیشانەی هەرە ئاشکرای زیندووەتی و هۆشیاری مرۆڤ، گەلێک باری ئەندازیارانە و زانایانەی ئەوتۆی تێدایە لەوە ناچێ بە جۆرێکی عەفوی و لە خۆوە پەیدا بووبێ هەر دەڵێی پسپۆڕ و ئوستاد دروستیان کردووە.
مەبەستم لێرەدا ئەو زاراوە و ڕستە و داڕشتنانە نین کەوا دوای گۆڕان و فراژوویی و شارستانەتی لە زمانێکدا پەیدا دەبن چونکە دیارە بەرهەمی ئەو پلەیە سەرکەوتووەی زمان دەبێ بەرهەمێکی ڕێک و بە پێی دەستوور و ڕێزمان بێ: مەبەستم ئەو دروشمە پڕ ژیری و پسپۆڕیەیە کە زمانی پێش پلەی شارستانەتی و زانیاری نوێدا بەدی دەکرێ.

با لە «تعمیم» خۆ دەرخەم بۆ «تخصیص» و لە باری زمانی کوردیەوە بدوێم.

وەک دەزانین لە ماوەی چەند سەدساڵێکی ڕابردوودا زمانی ئاخاوتنمان لە بنچینەدا گۆڕانێکی بە سەردا نەهاتووە دووری خاتەوە لە زمانی نووسینمان. لە چەند وشەیەکی تازە درووست کراوە و هەندێک لاسایی ڕاوێژی ڕۆژاوا بەولاوە چی نوێی تێدا نییە جیاوازی کاتەوە لە زمانی کوردەواری 100-200 ساڵ لەمەوبەر: بەیتی عەلی بەردەشانی و هەڵبەستەکانی کوردی و نالی و حاجی قادر چ فەرقێکیان نییە لەگەڵ وتووێژی ئێستاکەمان، ئەو فەرقە نەبێ ئەوان لە سەلیقەوە نزیکتر قسەیان کردووە ئێمەش لەبەر خۆ پاراستن لە وشەی بێگانە وا دەبێ دەڵێی زمان دەگرین و بە وشەدا دەنووسین. ئەو کوردیەی خۆمان کە گۆڕانێکی شارستانی و زانستی ئەوتۆی بە سەردا نەهاتووە پەکی بخا لەوەی ببێ بە نموونەی ڕەسەن بۆ داڕشتنی ئوستادانە، وەک سرنج دەری دەخا تا بڵێی دەوڵەمەندە لە ڕووی ڕێکی و ئەندازە و وردەکاریەوە. گەلێ جار بە دەست خۆم نییە هەستی شانازی دەکەم لەوەدا کە زمانی نژادەکەم ئەوەندە زیرەکی و مووقلاشی تێدا بە کار هاتبێ و لەگەڵ خۆمدا دەڵێمەوە میللەتێک توانیبێتی لە مەیدانی زماندا بەو ڕادەیە ژیرانە و جوانکارانە بنیادی تەعبیری دانابێ داخۆ ئەگەر لە هەموو مەیدانێکی

درووست کردن و بنیادناندا ئازادی و دەسەڵاتی تەواوی هەبا دەبوا چ بەرهەمێک بۆ خۆی و ئادەمیزاد بێنێتە دی. کورد لەگەڵ ئەو هەموو دیواری بەندیخانەی دەوری و کۆت و زنجیری دەست و پێی توانیوەتی موافقی سروشتی داهێنەر و سەلیقەی ڕاست و ڕۆناک ڕێبازی ئەوەندە هەموار بۆ ڕێزمان و ڕشتەی واتادەربڕین تەخت کا کەوا بە تێپەڕینی سەدان ساڵ لە ژێر دەستی و بێ خزمەتیدا کوێر نەبێتەوە، هەر دەڵێی یاریگەی ڕۆمەکانە لەبەر مەحکەمی و ئەندازەی بلیمەتانەی زەمانە نەیتوانیوە لە ناوی ببا.
کوردی گوتەنی، بێ لەگەمە، جێی سەرسوڕمانە کەوا زمانەکەمان بە جۆری ئێستاکەی لەلانی جوانی و دامەزراویەوە لە چنگی دڕندەی ڕۆژگار و ڕووداوە سامناکەکانی ڕزگار بووە. نەک هەر زمان بەڵکوو وابووە میللەتێک خوێشی لە ناو چووە لە ئەنجامی ڕووداوی کەمتر ناخۆش لەوەی بە سەر کوردا هاتووە.

هەرچەند ئێرە جێگەی لێکۆڵینەوەی ئەو هۆیانە نییە کە کورد و زمانەکەی پاراستووە، بەڵام نەفۆتانی کورد و زمانی باسێک نییە بەوەندە لێی ببیەوە بڵێی وا ڕێک کەوت و... وا قەوماو نازانم چی: هەر لەوەندە تێفکرە کە سوپای ئیسلام فارسەکانی پێچایەوە لە هەموو خاکی کە ئێستاکە پێی دەگوترێ عێراق تاکە شوێنەوارێکی فارسی تێدا نەمایەوە و هەمووی وردە وردە بوو بە عەرەب. بەڵام هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئەوەشدا کە کورد حکوومەت و سپای بەرگریشی نەبوو هەر مایەوە بۆ کورد و بە کوردی. وا دیارە ڕووداو تاکە هۆی کار کردن و ئەنجام دان نییە، ئەوەی ڕووداوەکەی بە سەردا دێ دەبێتە کەرتێکی «معادلە» ی مێژوویی. بۆ میسال با بڵێین بەردێک بە سەر شتێکدا بەربۆوە: قورسی و سووکی بەردەکە و ماوەی سەرەوژێربوونەوەی کاری خۆی دەکا، بەڵام چەند و چۆنی و ڕەقی و نەرمی ئەوشتەی دەکەوێتە ژێر بەردەکەوە تێکەڵی ڕووداوەکە دەبێ، ئیتر لە نەتیجەی بەیەک کەوتنەوەی هەر دوویان دەردەکەوێ داخوا کاریگەری ئەمیان یا بەرگرتنی ئەویان زیاترە. لەوانەیە ئەگەر ئەو شتەی خۆی گرت لەبەر تاوی بەردەکە کەمتر نەرم با وەیا بێهێزتر با ورد و خاش بووبا گەلانیش بەرامبەری کارەساتی مێژوو هەر

وان: گەل هەیە توانای بەرگری لە یەکێکی دیکە زیاترە، جا هۆی ئەو زێدە بەرگریە هەرچی دەبێ بابێ. مەیلێکی ئاشکرای فرەوان هەیە لە نێوان خاوەند ڕایاندا بۆ ئەوە بگوترێ مرۆڤ بە تێکڕایی چون یەکن و وەک یەک مل کەچن بۆ یاسای گۆڕان و پێش کەوتن و پاش کەوتن، بەڵام ئەم مەیلە لە چاوگەی «خۆشویستنی مرۆڤ» ەوە هەڵدەقولێ نەک لە واقیع وەیا لە زانستەوە: مومکین نییە ئەو گەلانەی لە جێگەی جیا جیا ژیابن و ڕووداوی لەیەکدی جیا کاری تێ کردبن، لە ئەنجامی هەزارانساڵی ئەو جیاوازییە هەر وەک یەک بن لە ڕووی هێز و توانا و قابلیتەوە. ئەوەی لێرەدا وا بە کورتی و سەرپێیی دەیڵێم لە ڕەگەزپەرستیەوە نییە و ناچێتە پاڵ ئەو فەلسەفەی دیواری هەڵاویردن و جیا کردنەوە لە میانی مرۆڤدا دروست دەکا: خۆ زۆر ئاشکرایە میللەتانی دواکەوتوو لە مەیدانی ڕەگەزپەرستیدا دەیێکی میللەتی پێشکەوتوو هۆی شانازی و خۆهەڵدانەوەیان نییە. کەواتە جگە لەوە ڕەگەزپەرستی لە خۆیدا کارێکی چەوتە، بە نیسبەت میللەتی دواکەوتوو دەچێتە ڕیزی خۆکوژیەوە. ئەوەی مەبەستی منە لە دەربڕینی ڕاستی، لەو باوەڕەمەوە سەر هەڵدەدا کەوا ڕێگەی کامرانی دەر ناکا بۆ مەڵبەندی ئاوات و ئومێد ئەگەر لە زەمینی ڕاستییەوە نەڕوا. بەلای منەوە خۆ بە سەهوو بردن لە واقیع ئەنجامەکەی هەڵدێرانە. کلۆڵییە. هەر بۆیەیشە پەروام نییە لەوە کە ناوناوە بە پێی داخوازی ڕوون کردنەوەی بابەت بەم لاو بەولادا سەر خوار کەمەوە و هەندێ جار تا کۆتایی ڕێچکۆلەیێکی فەرعی بڕۆم و لەو سەرەوە لەگەڵ نەختێک زانیاری یاریدەر بێمەوە ناو شەقامی ئەسڵی نووسینەکە.

وا لێرەدا یەکێک لەو ڕێچکۆلانە بانگهێشتنم دەکا تا گەشتێکی کورتیلەی تێدا بکەم.

لە سەرەتاوە گوتم ئاخاوتن ڕێزمانی پسپۆڕانەی تێدایە، ئێستاکە ئەوەش ئیزافە دەکەم و دەڵێم ئاخاوتن لە پلەیێکی یەکجار زووی پژانی هۆشی مرۆڤەوە دەست دەکا بە پێش کەوتن و ڕێک کەوتن. لەو مەیدانەدا ئاخاوتن ماوەیێکی

زۆر درێژ پێش دەکەوێتەوە لە کردەوە و بەرهەمەکانی دیکەی مررڤ وەک چاندن و مەڕداری و کشتوکاڵ و پێشەسازی و خانوو کردن و ئەنواعی هونەر و ڕستن... بگرە گۆشت برژاندن و چێشت لێنان. پێویست نییە بۆ میسال هێنانەوە بگەڕێینەوە بۆ مێژووی کۆن و تاریک چونکە ژیانی ئەوڕۆمان پڕە لە میسال: بەشی زۆری عەشایری کورد تا ئێستاکەش لە خانووی نارێک و پێکی ئەوتۆدا دەژین فەرقێکی چەندانی نییە لەگەڵ هێلانەی مەل و لانی هەندێ جانەوەر. بۆ خۆم لە ناوچەی ناودەشت و هەرێمی جەلک و مەلک لە قەزای ڕانیە خانووم دیوە بەرزایی دەرگە و بانەکەی لە گوێرەی بڵندی باڵای ئەو ئاژەڵە بووە کە خانووەکەی بۆ دروست کراوە، جا ئەگەر بۆ مەڕ کرابێ ڕەشەوڵاغی تێوە نەچووە. خاوەنەکەی دەبوا باڵای خۆی دوو کەڕەت بکا (بچەمێتەوە) تا دەچووە ژوورەوە لە ژوورەوەش هەر بە چەماوەیی هات و چۆی بۆ دەکرا: سەر بەرز کردنەوە و خۆ ڕاست کردنەوە لە ئیمکاندا نەبوو. ئەمە لانی بەرزایی، خۆ لە لایەن جوانی و ئەندازە و هونەرەوە هەر بە جارێ هیچ. ئەم عەشیرەتەی وا سەرەتایی لە مەیدانی گۆڕانی ماددی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا، لە قسە کردن و ئاخاوتندا ڕێزمانپەرست و ئەندازیارێکە تاکی نەبێ. با میسالی لەوەش ئاشکراتر بێنین بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست: منداڵ هێشتا بەسەر پێیان نەکەوتووە دەست دەکا بە گرۆگاڵی قسە کردن. بەر لەوە بچێ بۆ قوتابخانە ئەوەندەی باب و دایکی شارەزا دەبێ لە ئاخاوتن. وا بووە لەبەر مەلەکەی بەراورد کردن و بە یەکدی گرتن (مقارنە ومقایسە) منداڵ دووچاری هەڵە بووە لە قسە کردندا: بیستوومە منداڵ گوتووەتی «وەرم؟» کە ئەمەی اشتقاق کردووە لە فیعلی «وەرە» لە ڕێی بەراوردی کردن لەگەڵ فیعلی دیکەدا وەک «بخۆ، بخۆم؟ بڕۆ، بڕۆم؟ بشۆ، بشۆم؟ هتد».

ئا ئەم منداڵە هێشتا نە دەستی قەڵەمی گرتووە و نە توانیویێتی دوو شتڵە باینجان بچێنێ لە دێراوێکدا. دەوجا بۆ دەبێ مرۆڤ ئاخاوتنی زووتر پێش کەوتووتر بێ لە بەرهەمەکانی دیکەی؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ڕێچکۆلە

فەرعیەکەیە کە بانگهێشتنم دەکا. وەک من بۆی دەچم هۆی ئەم زوو و درنگییە لە سروشتی ئاخاوتنەوە هەڵدەستێ.

سرنج دەری دەخا ئاخاوتن براجمرانە (توأم) ی هۆشە. لەو ساوە هۆش پەیدا بووە ئاخاوتن پەیدا بووە: هەر بایی ئەوەی براجمرانەیێک لە کاتی زاندا دوای براکەی دیکە دەکەوێ ئاخاوتنیش دوای هۆش دەکەوێ. ئەو پەیوەندی ماددی و نیسبەتی برایەتی کە لە میانی هۆش و ئاخاوتندا هەیە بەدی ناکرێ لە میانی هۆش و هیچ بەرهەمێکی دیکەی هۆش. ئاخاوتن و هۆش ئەوەندە لە یەکەوە نزیکن و بە یەکەوە لکاون هەر دەڵێی دوو ڕووی یەک سککەن، بۆیە بە جۆرێکی عەفووی و بێ ئەرک و خەریکبوون هەر لە سەرەتاوە (سەرەتای پەیدابوونی هۆش پێش هەزاران ساڵ یا خود سەرەتای عومری منداڵی) بە ڕادەی پژانی هۆش ئاخاوتنیش دەگەشێ و دەکرێتەوە. وەک هۆش و ئاخاوتن بە موازاتی یەکدی دێن هیچ بەرهەمێکی دیکەی مرۆڤ بەو موازاتە نایێ لەگەڵ هۆش. هەمان سروشتی ڕێک خستن و ڕیز کردن و دەستوور دانان کە هۆش هەیەتی ئاخاوتنیش ڕاستەوخۆ دەیبێ: هەردووکیان لە یەک سەرچاوە هەڵدێنجن. تەنها زمانە بتوانێ هەموو ورتە و خورتە و خەیاڵ و وەسواسی هۆش تەرجەمە بکا بە جۆرێکی پیت بە پیت و لە هەمان کات. جگە لە زمان ئەمرازێک یا ئەندامێکی لەش یا هەر هۆیەک بێ ناتوانێ ڕاستەوخۆ و کوتومت بە پێی جووڵەی هۆش دەست هەڵێنج واتا دەربڕێ. تۆ لەوە گەڕێ دوای هەزاران ساڵ لە گۆڕان و پێشکەوتن مرۆڤ گەیشتۆتە پلەیەک لە ژیری و شارستانەتی بتوانێ بە هۆی ڕەسم و هەڵکەندن و مۆسیقا و دانس و ڕەمز تەعبیر لە دەروونی بدەنەوە، چونکە ئێمە قسە لە سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و هۆش و ڕاگەیاندن دەکەین نەک لە پلە هەڵکشاوەکانی پێشکەوتنی. بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو پێشکەوتنە و داهێنان و تەکنیکەشدا کە مرۆڤ پێکیهێناوە دوو جیاوازی گەورە هەیە لە میانی ئاخاوتن و هۆیەکانی دیکەی تەعبیر:

یەکەم: وەک ئاخاوتن بە ئاسایی و ئاشکرایی و دەسبەجێ واتا و مەبەستی هۆش دەردەبڕێ هۆیەکانی دیکە بەو جۆرە و نزیک لەو جۆرە ئامادەی واتا ڕاگەیاندن نین. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو هەر ناتوانن بە هیچ جۆرێک وەک ئاخاوتن ببن بە ئەمرازی خۆش جڵوەی ڕێزمانی و سەلیقەی بۆ تەعبیر: نە خەڵک هەموو دەبن بە ڕسام و پەیکەرتراش و مۆسیقار، نە هیچ پارچەیێکی هونەری ئەو هونەرانە لە واتاییێکی تایبەتی مەحدوود بەولاوە بە دەستەوە دەدەن: پەیکەرێک کە واتای «ترسان» ببەخشێ ئیمکان نییە ببێ بە «ترسام، ترسەنۆک، مەترس، ترس و لەرز، مەیانترسێنە، ترساندمت.. هتد» و تێکەڵ بە ڕشتە ببێ و بەشداری بکا لە واتای جۆرجۆر. هەروەها پارچەیێکی مۆسیقا و ڕەسم و دانیش..

دووەم: هەرچەند هۆی جیا جیا بۆ تەعبیر پەیدا بووبێ دیسانەوە وەک ئاخاوتن نین کە شان بە شان و جۆت لەگەڵ هۆش بێن و لە سەرەتای عومرەوە مرۆڤ فێریان ببێ وەک فێری ئاخاوتن دەبێ. ئەو هۆیانەی کە تازە بە تازە پەیدا دەبن بۆ تەعبیر گەلێک زەحمەتتر و گرێیاویترن لە کشتوکاڵ و ڕاو و مێوە چنین و بەقاڵی و قەسابی. تاک تاکە نەبێ خەڵق هەر نایانزانێ و فێریان نابێ. بگرە تێشیان ناگا.

برایەتی و خزمایەتی ئاخاوتن و هۆش نەک هەر لە ڕووی ڕێکی و دەستوور خوازییەوە، بەڵکوو لە باری «سلبی» شەوە خۆ دەنوێنێ: لە ئاخاوتندا «استثناء» و ناڕێکی و چەوتی دەردەبڕی، هەروەها هۆشیش بەسەهوو دەچێ و بڕیاری هەڵە دەدا و باوەڕی چەوت دادێنێ.

هەڵە و چەوتی باوەڕ و ئاخاوتنیش کە پەیدابوون تا ڕاست دەکرێنەوە وەیا دەسڕێنەوە زۆرەکی زۆری دەوێ. هەروەهاش تێ هەڵچوون بۆ گەیشتن بە سەر ڕشتەی ئەو چەوتی و هەڵەیە لە بیر و باوەڕ و ئاخاوتندا ئەوەندە دوور و قووڵمان دەبا سەرەدەری لێ نەکەین: لە فەرزی مەلەوانی ئەو گۆمەش بێین

و بمانەوێ بگەین بە چاوگەی سەرووی باسەکە لەم مەقالەیەدا هەر نایگەینێ. کەواتە با لێرە بەولاوە بچینە سەر ڕێبازی ئەسڵی نووسینەکە و پێشەکی و لاباس و تمهید وازبێنین.

وەک زانینی سەرەتایی وایە مجادلە هەڵناگری کە دەڵێم زمان بۆ دەربڕینی واتا جگە لە وشە و ڕستە ئەنواعی پیت و ئەمرازیش بە کاردێنێ. مەبەس لە «پیت» لێرەدا پیتی «املاء» نییە بەڵکوو پیتی ڕێزمانییە کە هەندی جار نرخی ناوی دەبێ چونکە مومکینە پیتێک بێ بە ڕاناو وەک لە گوتەی «دیتم» دا پیتی «م» بۆ شەخسی یەکەم دەگەڕێتەوە و دەلالەتی «مرۆڤ» ی هەیە.

دەبینی لە نووسین و ئاخاوتندا بە گۆڕین وەیا زیاد و کەم کردنی پیتێک لە وشە وەیا ڕستەدا واتا بە تەواوی دەگۆڕێ وەک کەچ، کەچە - مشت، مشتە- نووسین، نووسیم- هتد). لە زمانی عەرەبیدا ئەو پیتانەی کە دەخرێنە قاڵبی وشەوە وەیا لێی دەقرتێن بۆ پەیدا کردنی واتای تازە و جۆر جۆر لە هەمان وشە «أنسیتموها» پێک دێنن. بە زیاد کردنی یەکێک یا زیاتر لەو پیتانە و هاتنیان بۆ ناو وشە لە عەرەبیدا ئەوەندە وشەی تازە پەیدا دەبن نایێنە ئەژمار وەک «کتب، کاتب، کتبوا، اکتتاب، استکتب، مکاتبە، مکتب، مکتبە، مکتوب، اکتبوا، یکتبون، کتابە..» تا بەدوای کەوین لێی نابینەوە. لە کوردیشدا کۆمەڵێک پیت هەن دێنە ناو وشەوە بۆ پەیدا کردنی واتای تازە. هەر چەند ئەو پیتانە تا ئێستا کەس نەیژماردوون وەک هی عەرەبی، بەڵام سرنجێکی سەرپێیی دەری دەخا ژمارەیان لەو نۆیەی «أنسیتموها» ی عەرەبی یەکجار زیاترە. وا دەبێ یەک پیت، واش دەبێ لە یەکێک زیاتر پێکەوە دێنە ناو وشەوە و مانای دەگۆڕن وەیا لێی زیاد و کەم دەکەن. بۆ مەبەسی ڕوون کردنەوە چەند میسالێک دێنمەوە: «کوشتن. کوشتی. کوشتمان. کوشتووەتی. کوشتیان. کوشتتان. کوشتنەوە. دەکوژێ. بکوژ. بکوژە» لەم وشانەدا پیتی «ن، ی، م، ا، ە، و، د، ب» هاتنە استعمالەوە و بەشداربوون لە پێک هاتنی واتای

تازەدا، سەر ژماریشیان 8 بوو. «پوول. پوولەکی. بێ پوول. بە پوول. پوولدار. پوول بە پوول.» یا خود «نووسین. پێنووس. نووسەر. نووسراو» یاخود «کردن. هەڵ کردن. لێ کردن. دا کردن. ڕا کردن. پێ کردن. کردنەوە» بۆ خۆت پیتی تازە هاتوو بۆ ناو وشەکان بژمێرە و خەریکی میسالی دیکە بە تا دەگەی بە هەژماری هەموو ئەو پیتانە لە کوردیدا دێنە ناو وشەوە دەبن بە هۆی دارشتنی(اشتقاق) وشەی تازە.

لەم گوتارەدا نووسینەکەمان تەرخان کراوە بۆ باسی ڕۆڵی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا چ بە تەنیا چ لەگەڵ پیتی دیکەدا بێتە ناو وشەوە و بەشدار بێ لە دەربڕینی واتا یا لە داهێنانی واتای تازەدا، دەبێ پێشەکی ئەوەندە بڵێم ئەم باسە تا ئێسا، وەک گەلێ باسی دیکە، لە سەری نەنووسراوە یاخود من نەمدیوە کەس لە سەری نووسیبێ. کارێکی من لێرەدا دەیکەم سەرەتای لێکۆڵینەوەیێکە قووڵایی و پانایی تەواوی هەیە و گەیشتن بەوپەڕی باسەکە پێوەستی بە سرنج دانێکی دوور و درێژ و بەراوردێکی فیلۆلۆجی پسپۆڕانەی فراوان هەیە. ڕەنگە بۆ دۆزینەوەی تەعلیلی هەندێ جۆر لە بەکار هێنانی «ی» لە کوردیدا نووسەر ناچار بێ بگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی کۆنی زمانەکە لەوە بتوژێتەوە داخوا ئەو پیتە لەو زمانانەدا کە کاریان کردۆتە سەر زمانی کوردی وەزعی چۆن بووە چی بەسەر هاتووە بەڵکوو لەم ڕێگەیەوە بگا بە سەرچاوەی پەیدابوونی یەک لە جۆرەکانی بەکار هێنانی ئێستاکەی. ئەم دوور و قووڵییە لە پەراوێزی باسەکەی من بەدەرە. ئەوەی لێرەدا دەیخەمە بەر چاوی خوێنەر بە کار هێنانی «ی» ـە لە زمانی قسە پێ کردنی ئەوڕۆماندا. هەڵبەت ڕوون کردنەوەی چەندوچۆنی ئێستاکەی زمانەکەمان ڕێگەی عەودالبوونی سەرەوژووری مێژوویی کوێر ناکاتەوەو ماوەش لە کەس نابڕێ بۆ هەوڵ دانی تەواو: ڕەنگە پێچەوانەی ئەمە ڕاست بێ بەو مانایە کە هەڵ کردنی مۆمێک هەرچەندی کزیش بێ کەم و زۆر تیشکێک دەپرژێنێ بە دەوروبەری خۆیدا. گەرچی کەم و کۆڕی و هەڵەش هەبێ و هەیە لە نووسینەکەمدا بەوەندە دڵ خۆش دەبم کە سرنجی زمانەوانی کورد و کوردیم

ڕاکێشابێ بۆ ئەم باسە و بەمەدا لایەنێکی مەیلەو شرایەوەی زمانەکەم خستبێتە بەر چاوی.

با ئەوەندەش بڵێم لێرەدا پیتی «ی» هەموو جۆرەکانی دەگرێتەوە چونکە لە ڕاستیدا هەموو هەر «ی» ن هەرچەند لە لاتینی بۆ هەر جۆرە «ی» ە وێنەیێک دانراوە. سروشتی«ی، و» ئەو جۆرجۆریە هەڵدەگرێ تەنانەت لەم ڕووەوە هەردووکیان خۆ لە پیتی «ا» یش جیاواز دەکەنەوە کە ئەمیش وەک ئەوان پیتە بزوێنە و لە عەرەبیدا بە هەرسێکیان دەگوترێ «حروف العلە». وەک لە پیتی «ی، و» قووچاو و کرایەوە هەیە لە پیتی «ا» دا ئەم دوو چەشنییە نادیترێ و ئیمکانی دیتنیشی نییە. دەڵێی «پەنیر، هەولێر- ڕۆژ، ڕوومەت» بەڵام بۆ «ا» هەر ئەو دەنگە هەیە کە لە وشەی «مانگ» دەبیسترێ. باسی سروشتی «ی، و» و جۆرەکانیان و «یەکبوون» ی هەموو جۆرەکانیان و ئەو دەمەتەقەی لەسەر ئەو باسەوە هەڵدەستێ لێرەدا جێگەی نابێتەوە و دەبێ وەک سەرەباسێکی «فونەتیک» قسەی لێ بکرێ. بە ئاواتەوەم زمانەوانێکی کورد لەم باسە پڕ لەززەتە بدوێ و تا دوا دڵۆپ، مەوزووعەکە هەڵگوشێ.

پیتی«ی» سروشتێکی نەرم و شلی هەیە لە سەر زمان سووک دێ. ئەم نەرم و شلیە وای کردووە پیتی «ی» بە ئاسانی بێتە ناو وشە و بە ئاسانی بسوێ و بچێتەوە. وەک لێرە بە دواوە ڕوونی دەکەمەوە، کورد ئەم لایەنەی بە سەلیقە هەست پێکردووە و بە جۆرێک لەگەڵیدا ڕەفتاری کردووە هەر دەڵێی بە (صراحە) تێمان دەگەینێ و پێمان دەڵێ مامڵەتم لەگەڵ پیتی «ی» دا مامڵەتێکی تایبەتییە، نەکەن لێی بە سەهوو بچن.

بۆ خاتری ئەم تێبینیەم لە ناو زنجیرەی باسەکەدا ون نەبێ و نرخی نەدۆڕێنێ، لێرەدا لە سەری دەڕۆم تا لێی دەبمەوە ئەوجا دەگوێزمەوە بۆ ئاڵقەیێکی دیکە لە زنجیرەکەدا.

گوتم پیتی«ی» نەرم و شلە بە ئاسانی دێت و دەچێتەوە. هاتنی بۆ ناو وشە و ڕستە مەوزووعی ئەسڵی نووسینەکەمە تا کۆتایی باسەکە دەیخوێنێتەوە بەڵام سوان و تێچوونی ئێستاکە بە جۆرێکی سەربەخۆ لێی دەکۆڵینەوە.

دەزانین زمانی کوردی بۆ وەسف و ئیزافە و شەخسی سێیەم لە فرمانی مازی تێپەڕدا (فعل ماض متعد المفردالغائب) پیتی «ی» بە کار دێنێ: «بەردی ڕەق- کراسی بارام - کردی و چاندی».

لێرەدا وشەکان کۆتاییان هاتووە بە پیتی دەنگدار «کراس، بەرد، کردن، چاندن». دەوجا با بزانین کە وشەی «موصوف یا خود مضاف) یا فیعلی تێپەڕ کۆتاییەکەی پیتە بزوێنی «ی» بوو پیتە بزوێنی «ی»ی ئیزافە و وەسف و شەخسی سێیەمی بە دوادا هات کورد چی کردووە!

لە وشەی «ترۆزی و ماسی و دزین» پیتە بزوێنی «ی« کۆتاتییە. با ئێمە وەسف بۆ «ترۆزی» و ئیزافە بۆ ماسی بێنین و دزینیش بخەینە پاڵ شەخسی سێیەم لە مازیدا.

دەڵێن «ترۆزی ناسک، ماسی زەلم، بارام دزی». پێویست نییە من بڵێم، ئاشکرایە کەوا لە قسە کردن دا «ی» وەسف و ئیزافە و شەخسی سێیەم بە هیچ جۆرێک دەرناکەوێ و درێژایی «ی» کەی کۆتایی وشەکە زیاد و کەم ناکا. چ بڵێی «ترۆزی خۆشە» چ بڵێی «ترۆزی ناسک» فەرقێک بە «ی» کەی ناکەی و لە هەر دوو حاڵیشدا درێژی دەکەیەوە، خۆ مەعلوومیشە ڕستەی «ترۆزی خۆشە» پیتە بزوێنی «ی» ی ئیزافە و وەسفی تێدا نییە تا بگوترێ بۆیە بە قەدەر «ترۆزی ناسک» درێژ بۆتەوە. واقیع ئەوەیە «ی» کەی ئیزافە و وەسف لە قسە کردندا کەم و زۆر خۆ بە دیار ناخەن و بە تەواوی لە ناو دەچن. لێرەدا چاو لەوە بپۆشە من هەر میسالی وەسف دێنمەوە و دەڵێم «ترۆزی ناسک» چونکە فەرقی ئەم و «ترۆزی هەولێر» نییە

حوکمی هەردوویان یەکێکە. بۆ شەخسی سێیەمیش چ بڵێی «بارام نووسی» چ بڵێی «بارام کردی» لە هەردوو حاڵدا درێژایی «ی» کە لە کۆتایی هەر دوو فەرماندا بە قەدەر یەکن. دیاریشە وشەی «کردی» کە لە چاوگی «کردن» ـەوە هاتووە بە ئەسڵ «ی» لە کۆتاییدا نییە تا بڵێین بۆیە ئەویش وەک وشەی «نووسی» درێژ بۆتەوە. بەڵێ گومان لە وەدا نییە کورد بڕیاری داوە کە «ی» شەخسی سێیەم و ئیزافە و وەسف کەوتە دوای پیتەبزوێنی «ی» وە دەبێ بقرتێ. بەڵام زۆربەی نووسەرانی کورد ئەم «ی» ـە قرتاوە ئیعدام کراوە زیندوو دەکەنەوە و دەینووسن، بەڵگەشیان ئەمەیە گۆیا بە پێی ڕێزمان دەبێ«ی» هەبێ ئیتر ئەگەر لە قسە کردندا خۆ بە دەر نەخا لە نووسیندا دەبێ بگەڕێتەوە نەکا دەستووری زمانەکە تێکچێ. جارێ لە پێشەوە با ئەوە بڵێم ئێمە کە زانیمان بە ئەسڵ«ی» هەیە و ئەم ڕاستیەمان خستە ناو کتێبەکانی دەستووری زمانەوە لزووم نامێنێ ترسی تێک چوونی دەستوور وەیا توهمەی نەزانین هانیان بدا لەو ناوەدا «ی» یەک قوتکەینەوە. ئەگەر ئەو ترسە یەخەگیرمان بێ و بمانکا بە دیلی خۆی دەبێ لە قسە کردنیشدا چارێکی ئەو ترسە بدۆزینەوە، خۆ ئێمە بە ئاخاوتن سەد ئەوەندەی نووسین زمانەکەمان بە کار دێنین فایدەی چی ئەم «ی» یە نازدارە جارێکیان بە نووسین زیندوو کەینەوە و سەد جاران لە ئاخاوتندا بیمرێنین. دوور نابینم ڕۆژەک لە ڕۆژان پێشنیارێک بلێ کە لە قسە کردندا گەیشتیتە «ی» ی قرتاو برۆیەکت هەڵتەکێنە تا ببێتە نیشانەی هەبوونی... وەنیە من ببڕای ببڕای دانانی نیشانە لە جێی پێویست لە نووسیندا پەسند نەکەم، بەڵام نابێ ئەو کارە بێلزووم بێ. خۆ بە نیسبەت ئەم «ی» یە قرتاوە ئیشارەت دانان نەک هەر بێلزوومە بەڵکوو دژی ئیرادەی خاوەنی زمانەکەیە کە میللەتی کورد، چونکە ئیرادەی کورد ئەوەیە کە لە ئاخاوتندا «ی» دەرنەکەوت ناشێ بە هیچ جۆرێک دەرکەوێ یا خود با بڵێم دەرنەکەوتن «ی» لە ئاخاوتندا بە گوێرەی ئیرادە و بڕیاری ئاشکرای گەلی کورد مانای ئیعدام کردنی دەبەخشێ. بەڵگەش بۆ ئیسپات کردنی ئەم بڕیارە کەم نییە.

یەکەم: دەزانین لە کوردیدا جۆرێک لە جۆرەکانی دارِشتنی ئیسمی مەعنا abstruct لە ئیسمی مادەوە زیاد کردنی پیتە بزوێنی «ی» تیژە لە کۆتایی وشە. دەڵێی «چاک – چاکی، خۆش – خۆشی، سەوز - سەوزی». دەبا لە کۆتایی وشەکە پیتە بزوێنی «ی» ی تیژ بۆ «وەک سپی، برسی» ئاخۆ بۆ دارِشتنی ئیسمی مەعنا چی دەکەین؟

بە پێی قاعیدەی ئیزافە و وەسف و شەخسی سێیەم کە لێرە بە پێشەوە لێی دواین دەبوا لە دارِشتنی ئیسمی مەعناشدا وشەکە وەک خۆی بمێنێتەوە، ئەو «ی» یە کە بۆ ئیسمی مەعنا زیاد دەکرێ لە قسە کردندا خۆ بەدەر نەخا و تێبچێ. کەچی خاوەنی زمانەکە لێرەدا بڕیارێکی زۆر جیاوازی داوە کەم و زۆر لەگەڵ دەستووری ئیزافە و وەسف شەخسی سێیەم پەیوەندی نییە: چونکە مەبەستی ئەوە نەبووە «ی» کە بفەوتێ«سیغە» یێکی تایبەتی داناوە بۆ ئەوە هەم ئیسمی مەعناکە دروست بێ و هەم «ی» کە بپارێزرێ. فەرموو سەیری ئەم میسالە بکە:

دەڵێی «زەرد - زەردی، شین – شینی، سەوز - سەوزی» بەڵام لەگەڵ «سپی» دا کارێکی دیکە دەکەی و دەڵێی «سپی، سپیەتی». خۆ بە پێی زاهیری دەستووری «نووسی و ترۆزی ناسک» دەبوا لێرەشدا هەر بڵێی «سپی» و یێیەکەی ئیسمی مەعنا ئیعدام کەی.

دەڵێی «تێر - تێری» کەچی دەڵێی «برسی - برسیەتی، هەندێکیش دەنووسن برسی یەتی». دەبوا وشەی برسیش لە ئیسمی مەعنادا هەروەک خۆی بمێنێتەوە «ێ» یە تازەکە تێبچێ.

دەبینی لەو حاڵانەدا خاوەنی زمانەکە ڕێی نەهێشتنی «ی» کەی نەداوە خۆ ئەگەر بەرژەوەندی دیبا یا ئارەزووی کردبا کەس مەنعی نەدەکرد لە ئیعدام کردنی، ئەوسا من و تۆش بۆ خەمان لە نووسیندا وەستاییمان بە خەرج دەبرد

و «ی» یەکمان قوت دەکردەوە وەک کێلی قەبر و دەمان نووسی «برسی ی، سپی ی».

دووەم: لە حاڵی نیسبەتیشدا وەک مەعلوومە پیتە بزوێنی «ی» ی تیژ دەخرێتە کۆتایی وشەوە وەک «شارەزووری، هەولێری، نەجەفی». ئەوەندە هەیە ئەگەر کۆتایی وشەکە بزوێنی «ا، وو، ۆ، ێ، ە» بوو لەبەر ناچاری «ی» یەکی دەنگدار consonant دەخرێتە میانی ئەو پیتانە و «ی» ی نیسبەتەوە تا ئیمکان هەبێ تەلەفوز بکرێ چونکە پیتە بزوێن هەڵناگرێ پیتە بزوێنێکی دیکەی بچێتە سەر. دەڵێی «خورما- خورمایی، بانە- بانەیی، شنۆ- شنۆیی، لادێ- لادێیی، مازوو-مازوویی». ئەدی ئەگەر کۆتایی وشەکە پیتە بزوێنی «ی» ی تیژ بوو (ئەو پیتە بە پێی بڕیاری کۆڕی زانیار «ی» دەنووسرێ، زۆربەی نووسەران بە دوو «ی» ی دەنووسن: هەیشە ئیشارەییێکی دیکەی بۆ دادەنێ) ئەوسا دەبێ نیسبەت بۆ ئەو وشەیە چۆن بێ؟ بە پێی قاعیدەی باس لێکراوی ئیزافە و هاوڕێکانی دەبوا «ی» کەی نیسبەت خۆ بەدەر نەخا و وشەکە وەک خۆی بمێنێتەوە. کەچی کوردەواری وای نەکردووە، هەرچەند هەموو کورد لە یەک ڕێبازەوە نەڕۆیشتوون بۆ دەربڕینی نیسبەت لەم حاڵەدا بەڵام هەموو لەوە ئیتفاقیان کردووە کە نابێ «ی» ی نیسبەت ئیعدام بکرێ. ناوچەی کۆیە بۆ داڕشتنی سیغەی نیسبەت لە وشەی وەک «جەلی و سماقووڵی و سلێمانی» دەڵێ «جەلیەتی، سماقوولیەتی، سلێمانیەتی» واش دەبێ دەڵێ «جەلەتی، سماقوولەتی، سلێمانەتی» هەندێ ناوچە لەو حاڵانەدا ئەم سیغەیە بەکار ناهێنێ «ی» کەی نیسبەتیش ئیعدام ناکا دەڵێ «کابرایەکی جەلیەتی فەردە تووتنێکی دەفرۆشت». ئەمە بۆیە دەگێڕمەوە چونکە لە هەندێ زمانەوانی خەلقی ناوچەی سلێمانیم بیستووە ئەم سیغەیان بەرگوێ نەکەوتووە کەچی دەوروبەری کۆیە زۆر باوە.

سێیەم: وا دەبێ واوی بزوێن (ئەوەی هەندێ نووسەر بە دوو «و» ی دەنووسن، کۆڕی زانیاریش ئیشارەی دەخاتە سەر «و») وەک «ی» ی

بزوێن دەکەوێتە کۆتایی وشەوە وەک «دوو، پشوو، خوو». بە پێی قیاس دەبوا ئەگەر واوی عەتفی بەدوادا هاتبا واوەکەی عەتف تێچووبا و خۆی بەدەر نەخستبا هەروەک دیتمان «ی» بەدوا پیتە بزوێنی «ی» دا لەناو دەچێ. بەڵام کورد واوی عەتفی نەفەوتاندووە با بە دوا وشەیێکیش بێ کە کۆتایی پیتە بزوێنی واوی تیژ بێ. کە دەڵێی «دوو و سێ» خۆ خەریک دەکەی واوەکە بە ئاشکرایی و بێگومان بدرکێنێ هەرچەند دەربڕینی واوەکە سەهلیش نییە. بۆ ئەوە واوەکە بە باشی ببیسترێ بە دوا واوی کۆتایی وشەکەدا، دەیبزوێنی و «ضمه» یێکی سووکی دەدیتی نەکا لە پەنا پیتە بزوێنی پێش خۆیدا نموودی نەبێ تۆ کە دەڵێی «کورد و عەرەب» واوەکەی عەتف لێرەدا واوی بزوێنە چونکە بە دوا پیتی«د» دا ترسی لە ناوچوونی نییە بەڵام کە دەڵێی «دوو و سێ، ڕوو و دەست» لە ڕاستیدا واوەکەی عەتف دەکەی بە دەنگدار و واوێکی بزوێنی کورتی بە دوادا دێنی تا واوەکەی عەتف لە ژێر تاوی واوەکەی کۆتایی وشەی پێشەوە نەشرێتەوە، تەنانەت بە پێی دەستووری نووسین دەبێ «ڕوو وو دەست، دوو وو سێ» بنووسرێ.

ئەمە جارێکی دیکەش ئیرادەی کورد دەردەخا لە چۆنیەتیی مامڵەتیی لەگەڵ وشە و پیت و قسەکردن. بە لای کوردەوە واوی عطف ئەوەندە گرینگە و سەربەخۆیە ناشێ بسوێ و لەناوبچێ. وەک «ی»ی ئیزافە و وەسف و شەخسی سێیەم نیە سوانی زەرەر نەبەخشێ. تۆ کە گوتت «ڕو دەست، دو سێ» واتاکەت کورت دێنێ و مەبەست ڕوون نابێتەوە. هەندێ جار سوانی واوی «عطف» و ونبوونی لە میانی دوو وشەدا وشەی لێکدراو پێک دێنێ یاخود واتاییێکی ئەوتۆ دەبەخشێ پەیوەندیی نەبێ لەگەڵ «عطف». کە بڵێی «دوسێ» وەک ئەوەیە گوتبێتت دوجار سێ کە دەکا شەش، بۆیە ناچاری کە مەبەست لە «دو سێ» 2+3 بێ دەبێ بە ئاشکرایی واوەکەی میانی وشەی «دو» و «سێ» بدرکێنی و بڵێی «دو و سێ» تا بکەن پێنج. دەوجا کە قرتانی واوێک ئەوەندە ئیشکال دروست بکا دیارە نابێ بقرتێ. کورد ئەوەی هەست پێ کردوە بە جۆرێکی سەلیقەیی و بێ مامۆستا، ڕێزمانی وتووێژیشی

به پێی ئەو هەست و سەلیقەیە دارِشتووە. حەیف و صەد حەیف ئێمە دروشمی زەکا و ئیدراکی فیتری ئەو گەلە بسرِینەوە بە خۆتێهەڵقوتاندنی دوور لە شارەزایی هەرچەند لە ڕواڵەتدا هەڵقوتانەکەمان بە کارێکی ئوستادانەش بێتە پێش چاوان.

قسە لەوەندە نابرِێتەوە، سەرەرای ئەوە ژیاندنەوەی «ی» ی مردوو لە نووسیندا کاریکە دوور لە شارەزایی و پرِە لە ستەم دژی زەکای کوردەوارییی، ئا ئەم ژیاندنەوە بەرەنگاری فرمانێکی بێ سەر و بنمان دەکا و ئەرکێکمان دێنێتە بەر لێی دەرنەچین، چونکە لە کوردییدا وەنیە هەر «ی» لەو شوێنەدا سوا بێ بەڵکو پیتی قرتاو لە زمانەکەماندا ئەوەندە زۆرە و جێگاکانی ئەوەندە جۆر جۆرە ئەگەر وەک «ی» هەموویان بژێنەوە زمانەکە تێک دەچێ و لە کوردی دەشۆرێ. ڕێی ئەوەشت نیە بڵێی هەر «ی» دەژیێنمەوە مەگەر خۆتم لێ بکەی بە حاکمی عورفی چونکە فەرقی «ی» نیە لەگەڵ پیتی دیکەدا کە ئەمیانت ژیاندەوە دەبێ هەرچی وەک ئەو مردو بن بیان ژێنیتەوە. قیامەت هەر لە بەرخی مەلادا نەهاتووە، دەبێ لە نووسیندا «بەرەڵلا» بگەرِێنیەوە بۆ «بەرهەڵدراو»، «هەستە» بکەیتەوە بە «هەڵ بوەستە»... کلۆج، کل وجە... نەخوازەلا، نەخوازێ ئەڵلا یا هەر بنجێکی دیکە بێ... مریشک، مری هیشک... مراوی، مری ئاوی... گۆرانی یاریکە ڕاکە پێکەنە، دەبێتە یاری بکە ڕا بکە پێ بکەنە. دەبێ ساڵەها خەریک بی ئەسڵ و فەسڵ و بنج و ڕەگی هەموو وشەیێک لە کوردیدا بدۆزیەوە و وای بنووسی. کە ئەمەت کرد زمانی کوردیت کوشت، کە ئەمەش نەکەی نابێ تەنها یەخەی «ی» بگری و دەستە ملانی بی.

لە کوردیدا قرتاندن «حذف» دەستوورێکی زۆر پەرەسەندووە و ڕێزمانیشە، ئەوەندە هەیە نابێ قرتاندن تەرتیبی پیتی وشە بگۆرِێ چونکە کە ترتیبی گۆرِا وشەکە دەبێتە نارِەوان. بۆ میسال، وشەی «دشنام – دژنێو» لە ڕێی قرتاندن بوە بە «جنێو، جوێن، جون». گۆرِینی «دژنێو» بۆ «جنێو» سەلیقەی ڕاست

پەسەندی دەکا چونکە دو پیتی «دژ» بە کورت کراوەیی گۆڕاون بۆ «ج» کە لە درکاندندا نزیکە لە «دژ». دیارە تاکە پیتی «ج» لە سەر زمان سوکترە لە «دژ». کەواتە لەو گۆڕین و کورت کردنەوەدا سوود بەرهەم هاتووە بێ ئەوەی تەرتیبی پیتەکان تیک بچێ. ئیتر لەوە زیاتر چیمان دەوێ کە لە ڕێبازێکی هەموارەوە زمانەکەمان ئاسانتر کەین. بەڵام گۆڕینی «جنێو» بۆ «جوێن» تەرتیبی پیتەکان تێک دەدا بۆیە بە «ڕەوان – فصیح» لە قەڵەم نادرێ کەواتە نووسەر دەبێ خۆی لێ بپارێزێ. کە «جوێن» ناڕەوان بوو «جوون» هەر بە جارێ لە ڕەوانی دەشۆرێ. بەڵێ خەڵق لە قسەکردندا هەموان دەڵێن و کەسیش ڕێی نیە مەنعیان بکا بەڵام ئەوەی غەڵەتە هەر غەڵەتە، لە کوردیدا بێ یا هەر زمانێکی دیکەی جیهان بێ، خۆ ناشکرێ و ناشێ غەڵەت بە ڕاست حیساب بکرێ.

میسالێکی دیکەت بۆ دێنمەوە، دەگوترێ «لە بۆچی هات؟» ئەمە کورت کراوەتەوە بۆتە «بۆچی هات؟». جارێکی دیکەش کورت کراوەتەوە بووە بە «بۆ هات؟». ئەم سێ ڕستەیە تا ئێستا لە قسە کردندا زیندون. بەلای منەوە هەر سێ ڕستە دروستن، چونکە لە کورت کردنەوە بەولاوە شتێک نەهاتۆتە ناوەوە لە ڕاستییان دور خاتەوە و بیان کا بە هەڵە. کورت کردنەوەش لە کوردیدا دەستوورە، هەر مامڵەتێکیش بەر دەستوور کەوت پەسەندە.

بەڵام گۆڕین و کورت کردنەوەی «لە بۆچی هات؟» تا دەبێتە «لۆچی هات یاخود لۆ هات» لە دەستوور لای داوە چونکە دیارە وشەی «لۆ» لە ئەسڵدا مەوجود نیە و پێکهێنراوە لە لامەکەی «لە» و واوەکەی «بۆ». واتە «لە بۆ» کراوەتە «لۆ». ئەم داڕشتنە بەر هیچ دەستوورێک ناکەوێ تا بڵێین داڕشتنێکی ڕاستە. ئەگەر لە کوردیدا «لە لۆچی» هەبا ئەوسا دەمانگوت «لۆچی، لۆ» کورت کراوەن دەبوون بە «فصیح، ڕەوان» چونکە گوتمان کورت کردنەوەی دەستووری «ڕەوانی» تێک نادا. نووسەر و پشکنەر و لێکۆلەرەوە ڕێی ئەوەی هەیە وەک زانای ئەکادێمیی بنج و بناوانی گوتە و

ڕشتەو دەستووراتی زمانەکە هەڵتەکێنێ بیانباتەوە سەر ڕەگ و بنکە و بناخەی ئەسڵییان، لەو ڕێبازەشدا تا بەرەو مێژووی کۆن هەڵکشێ و لە سرنج و تێفکرین و بەراوردی کردنی قوڵ بیتەوە زیاتر خزمەتی زمانەکەی دەکا و هەوڵ و تەقەڵلاکەی بەرهەمدارتر دەبێ. بەڵام ڕێی ئەوەی نیە دۆزینەوەی ئەسڵی وشەیێک بکا بەهۆی ئیعدام کردنی وشەیێکی دیکە کە لە ڕێی گۆڕان و کورت کردنەوەدا شکڵێکی تازەی پەیدا کردووە. زانایێکی گۆڕانی گیانلەبەران با ئەسڵی ژیان بدۆزێتەوە و بە پێپلکری گۆڕاندا سەرەوژێر و سەرەوژوور بروا تا مرۆڤ دەگەیەنێ بە گیانلەبەری «یەک خلیە»، بەڵام تۆ بڵێی بۆی هەبێ بڕیاری ئیعدامی مرۆڤ بدا چونکە ئەسڵەکەی دۆزیوەتەوە؟ یاخود لە ناوچەوانی هەموو کەسێک بنووسێ ئەمە لە ئەسڵدا «یەک خلیەیی» بووە نەکا ئەو ڕاستییە فەرامۆش بکرێ؟ بەس نیە زانیارەکە و ڕاستیەکە تۆمار بکا و بیانپارێزێ لە فۆتان بێ ئەوە خۆی و خەلق دووچاری ئەرکی بێلزوم بکا؟

زمان چونکە کەرستەی تەعبیری گیانلەبەرێکی قابلی گۆڕانە ئەویش لە گۆڕاندایە. ئەگەر بە ڕادەی گۆڕانی ژیان و یاسای کۆمەڵایەتیی و بەرهەمی زانستیی ئادەمیزاد زمانەکەی نەگۆڕێ و پێش نەکەوێ دیارە وردە وردە کز دەبێ تا بە جارێ دەکوژێتەوە. دەبێ فرمانی زمانەوان ئەوە بێ یارمەتیی زمانەکەی بدا تا دەسەڵاتی تەعبیری زیاد کا و شیایی ژیان و گەشەکردنی بگا بە پلەی سەرسوڕێنی زانست و تەکنیکی نوێ. یارمەتی دانیش لەوەدا نیە زمان بخرێتە قاڵبی مردوو و ڕێگەی ئاسانبوون و مشتوماڵ کردنی لێ بگیرێ. بە ڕادەی ئەوە کە گێڕانەوەی ژیان بۆ صەدەی چواردەهەم و پازدەهەم دەیکوژێ و لە ناوی دەبا گێڕانەوەی زمانیش بۆ ڕابردووی کۆنی پەکی مانەوە و گەشەکردنی دەخا. سەرڕای هەموو ئەو تێبینیانە و گەلێکی دیکەی کە هەن و نەمهێنانە ناو باسەکەوە شتێکی زۆر گرینگ هەیە دەبێ ڕەچاوی بکەین. کە بڕیارمان دا ئەو پیتانەی لە قسەکردندا سواون لە نووسیندا بگەڕێنەوە ئیتر نووسەری عادەتیی کوردیی لە بازاڕ و دەرودەشت بۆ خۆی دەست و قەڵەمی

ڕەق دەبێ چونکە مەعلوومە نووسەری عادەتیی ئەو دەستوور و ڕێزمانە نازانێ فێری ئەوەی بکا لە کوێ پیت قرتاوە تا لە نووسیندا بیگێڕێتەوە. زانینیی ئەم لایەنە نەک هەر بۆ پیاوی عادەتیی بەڵکو بە نیسبەت خوێندەواری فراژووشەوە زەحمەتە. فەرموو لەگەڵ مندا سرنجێک بدە ئەم زەحمەتیە.

شەخسی سێیەمی تاک لە فیعلی مازی تێنەپەڕدا ڕاناوەکەی دەرناکەوێ وەک لە تێپەڕدا دەردەکەوێ. دەڵێی «ڕۆیشت، خەوت، نووست، هەڵستا، مرد، ژیا، چوو، هات» لەمانە و هەموو فیعلێکی تێنەپەڕی وەک ئەمانە «ی» ی شەخسی سێیەم وجودی نیە. کەواتە ئەوانەی کە لە فیعلی تێپەڕی وەک «نووسین، دڕین، پرسین، کڕین، دزین» بۆ شەخسی سێیەم «ی» یەک بە زیادەوە دەنووسن «پرسیی ی، کڕیی ی، دزیی ی» دەبێ ئاگاداری ئەوە بن لە مازی تێنەپەڕی شەخسی سێیەم کە بە ئەسل فیعلەکە «ی» ی تێدا بێ نابێ «ی» یەکی دیکەی لێ زیاد کەن. «فڕین، خزین، خشین، ڕزین» و هەموو فیعلێکی تێنەپەڕی وەک ئەوان کە خرایە پاڵ شەخسی سێیەم دەبێ بنووسرێ «فڕی، خزی، ڕزی» چونکە لەو حاڵەدا شەخسی سێیەمی تاک ڕاناوی نیە. دەوجا سەیری نووسەری عادەتیی کورد بکە چۆن سەری لێ ناشێوێ کە دەیەوێ بنووسێ «دزی و فڕی و خشی و بڕی»؟ لە کوێ ئەم «ی» یە قوت کاتەوە وەک کێلە قەبر و لە کوێ بیخاتە قەبرەوە وەک مردوو!

ئەم زەحمەتیەت لە بیر بێ و بە چاوێکی پڕ لە وردیی و ژیریەوە سەیرێکی فەلاکەتی لێرە بە دواوە بکە.

گوتمان و دیتمان ڕاناوی شەخسی سێیەمی تاک لە فیعلی مازی تێپەڕدا «ی» یە. بە پێچەوانەی ئەو، ڕاناوی شەخسی دوەمی تاک لە فیعلی مازی تێنەپەڕدا «ی» یە یاخود «یت»ە. بۆ شەخسی سێیەم دەڵێی «کوشتی، بردی، کردی» بۆ شەخسی دوەم دەڵێی «بردت، کوشتت، کردت» بەڵام بۆ

شەخسی دووەم لە مازی تێنەپەڕدا دەڵێی «نووستیت، هەڵستایت، کەوتیت، ڕۆیشتیت» هەیشە دەڵێ «نووستی، هەڵستای، کەوتی، ڕۆیشتی» بۆ مەبەسی کورد کردنەوە «خۆم لەوانەم». کەواتە بە پێی مەزهەبی دۆستانی «ی» ی قرتاو لەو فیعلە تێنەپەڕانەی کە بە ئەسڵ «ی» هەیە وەک «فڕین، خزین، خشین» دەبێ بۆ شەخسی دووەمی تاک بنووسی « فڕی یت، خزی یت» یاخود «فڕی ی، خزی ی، خشی ی» ئەگەر ویستت بۆ ئیختیصار «ت» یەکە بقرتێنی.

بەڵام لە فرمانی «مضارع» دا فرمانکە تێپەڕ بێ یا تێنەپەڕ بێ ئەو «ی» یەی شەخسی دووەم هەر دیتە ناوەوە. دەڵێی «دەنوی، دەڕۆی، هەڵدەستی یاخود دەنویت، دەڕۆیت، هەڵدەستیت» هەروەها دەڵێی «دەخۆی، دەکەی، دەکوژی — دەخۆیت، دەکەیت، دەکوژیت» لێرەشدا دەبێ ئاگاداری ئەوە بی فەرقی تێپەڕ و تێنەپەڕ نەکەی و «ی» یەکی زیاد بخەیە کۆتایی ئەو فرمانانەوە کە لە ئەسڵدا «ی» یان هەیە و بنووسیت «دەفڕی ی، دەخشی ی، دەخزی ی، دەنووسی ی، دەدزی ی، دەدڕی ی — یاخود دەفڕی یت، دەخشی یت، دەدزی یت...هتاد» ناشزانم چۆن دەتوانی خۆت ڕزگار کەی لە ئیشکالی ڕێنووس داخوا دەنووسی «فڕی یت، فڕی ی ت، فڕییت». پشووی حەسانەوە مەدە فەلاکەتی دیکەش لە پێشە.

بۆ «جمعی متکلم» لە فەرمانی مازی تێنەپەڕ دو پیتی «ین» بەکار دێ وەک «نووستین، ڕۆشتین، هەڵستاین» لە مازی تێپەڕ دەگوترێ «کردمان، بردمان» لە فرمانی مضارعیشدا ئەم «ین»ە بۆ «جمعی متکلم» هەر دێتەوە بەڵام ئەمجاریان فرمانەکە تێنەپەڕ بێ و تێپەڕ بێ فەرق ناکا. دەڵێی «دەڕۆین، هەڵدەستین، دەنووین» هەروەها دەشڵێی «دەکەین، دەخۆین، دەبینین» کەواتە بۆ «جمعی متکلم» یش وەک شەخسی تاکی دووەم لە فرمانی مازی تێنەپەڕداو لە فرمانی «مضارع» ی تێپەڕ و تێنەپەڕدا «ی» یەکی زیاد دەبێ بخەینە پاڵ «ی» ی ئەسڵی و بنووسین «فڕی ین، خزی

ین، نووسی ین، بڕی ین - دەفڕی ین، دەخزی ین — دەنووسی ین، دەبڕی ین». لە ئەنجامی ئەم تێکەڵپێکەڵی و مەعلوومات فرۆشیەدا ئەم لیستەی سیحری خوارەوە پێک دێ:

- «بارام دزی ی» چونکە مازی تێپەڕە بۆ شەخسی سێیەمی تاک.
- «بارام خزی» چونکە مازی تێنەپەرە بۆ شەخسی سێیەمی تاک.
- «جەنابت دزیت» چونکە تێپەڕە بۆ شەخسی دووەمی تاک.
- «جەنابت خزی یت» چونکە مازی تێنەپەڕە...
- «جەنابت دەدزی یت»، «جەنابت دەخزی یت» چونکە فرمانەکە «مضارع» ە بۆ شەخسی دووەمی تاک.
- «جەنابت دەچیت» چونکە فرمانەکە لە ئەسڵدا «ی» ی نیە.
- «ئێمە خزی ین» چونکە مازی تێنەپەڕە بۆ «جمعی متکلم».
- «ئێمە دەدزی ین»، «ئێمە دەخزی ین» چونکە فرمانەکە «مضارع»ە بۆ «جمعی متکلم».
- «ئێمە دەچین» چونکە فرمانەکە لە ئەسڵدا «ی» ی نیە.

لیستەییێکی ڕێکوپێک وەک «جۆگەلەی لۆغاریتم»، هەر دەبێ پیرۆزبایی بۆ بکەی لەو نووسەرانەی حەز لە پاراستنی ئەو شتانە دەکەن کە کورد کوشتووتی....

پێی ناوێ من بڵێم، لە خۆوە دیارە، ئەم شێوە نووسینە لە مەتەڵ دەچێ و هەر دەڵێی زەکای خەڵقی پێ تاقی دەکەیتەوە.

ئەوەی هێنامە پێش چاوی خوێنەر لەو چەند دێڕانەی دواییدا وەنیە بۆ مەبەسی نەسەلماندن وەیا خۆ هەڵدانەوە بێ، نەخێر ئەمە ئەنجامێکی «حتمی» یە ڕاستەوخۆ هەڵدەچێ لە کاسەی ئەو ڕێنووسەی کە دەنووسێ «ترۆزی ی ناسک».

زۆربوونی دەستوور لە زماندا بۆ خۆی دەبێتە ئامانجێک بەقەدەر زمانەکە زەحمەت، ڕەنگە لەویش زەحمەتتر بێ. قەواعیدی عەرەبی دە جار لە عەرەبی زەحمەتترە. گەورەترین نووسەر و بوێژی عەرەب ڕزگار نەبوون لە هەڵەی قەواعیدی. کەس نیە «قواعد اللغة العربية» بزانێ و هەڵەی تێدا نەکا، بەڵام دەیان ملیۆن کەس عەرەبی دەزانن، هەزاران خوێنەر و ئەدیبیش هەن پوختەیێکی باشی قەواعید دەزانن کە کافی بێ بۆ نووسین و تێگەیاندن. با ئێمە پەند لەوە وەرگرین و لە ڕێی مەعلوومات فرۆشیی و بە ناوی پاراستنی زمان، نووسین و ڕێنووس و ڕێزمان لە خەڵقی وەزەحمەت نەیەخین. تا دەتوانین بەرەو «ئاسانتر و سادەتر» ەوە بڕۆین بە مەرجێک نەچینە ناو سنووری هەڵە.

بە دەم نووسینەوە و لە ڕێی میسال هێنانەوە ناوی «ی» ئیسمی مەعنام هێنا. مەوزووعی «اسم المعنى — Abstruct noun» درێژە و تەفسیلێکی زۆری هەیە، لێرەدا لە گۆشەی نیگای پیتی «ی» و بەشداربوونی لە پێک هێنانی سیغەی «ئیسمی مەعنا» لە کوردیدا سەیری مەوزووع دەکەین و بەس.

وەک دیار دەکەوێ لە باسەکەمان، کورد بە سەلیقە لە داڕشتنی ئیسمی مەعنادا دەستووری وای بەکارهێناوە ئەویش وەک هەندێ لەو دەستوورانەی باسمان کرد هەر دەڵێی کاری پسپۆڕ و دەسکردی شارەزایانە نەک بەرهەمی عفوی و تێکڕای میللەتێکە.

ئەو وشانەی پێیان دەگوترێ ناوی مادە «اسم المادة» بە گوێرەی ڕادەی مادیەتیان دەکرێن بە سێ بەشی لە یەکتر جودا «من ئەو سێ بەشە پەسەندتر دەکەم لەوە بکرێ بە پێنج و شەش».

بەشی یەکەم: ناوی مادی تەواو. وەک «بەرد، خەڵووز، چیا، ئاو، برنج...»

بەشی دوەم: ناوێکە لە خودی خۆیدا مادە نیە بەڵام دەبێ بە ناو یاخود نیشانە و عەلامەت بۆ شتێک یا گیانلەبەرێک یا بۆ مرۆڤ کە هەموویان مادەن. وەک «قوتابی، قایمقام، کارگێڕ، فەللاح، پێشەنگ» و گەلێک لە ناوی وەزیفە و کەسبوکار. وەک دەبینی ئەم بەشەی دوەمی ناو، مەرج نیە ببێ بە ماڵ بۆ ئەو شتەی یا ئەو کەسەی پێی ناو نراوە. لەوانەیە یەکێک ئەوڕۆ قوتابی بێ ڕۆژێکی دیکە فەللاح بێ یاخود لە هەمان کاتدا قوتابی بێ و فەللاحیش بێ. بەڵام بەشەکەی یەکەم گۆڕانی تێدا نیە، بەرد هەر بەردە ئاویش هەر ئاو. کە بەردت ورد کرد و بوو بە گەچ لە بەردایەتیی دەشۆرێ، واتە وەک ئەو کەسە نیە کە فەللاح بێ و قوتابی بێ هەر هەمان کەس بێ، «شتێک» کە بەرد بوو یاخود ئاسن بوو کە بە هێزێکی فیزیایی وەیا کیمیاویی کرا بە مادەیێکی دیکە حیسابێکی تازەی بۆ دەکرێ لە ژێر ناوێکی تازەدا. بەرد هەر بەردە، بەرد گەچ نیە. بەر مادەیە قوتابی و موهەندیس لە خۆیانەوە مادە نین «اصطلاح» ن کراون بە ناو بۆ مادە. ئەم مقارەنەیە و لێکدانەوەی نەزەری دوور دەکێشێ تا دەگەینە کۆتایەکەی با لە کورتی بیبڕینەوە و بچینە سەر بەشەکەی سێیەم.

بەشی سێیەم: ئاوەڵناوە «صفە». لزوم نابینم لێرەدا بکەوینە سەر وەسف و ناساندنی «تعریف» ئاوەڵناو تا چەند دەلالەتی مادیەتی هەیە و چۆن وا دەبێ بە پێی سروشتی «موصوف» یاخود لەبەر داڕشتنی لەسەرچاوەیێکی نامادیەوە ئاوەڵناوەکەش لە مادیەت دەشۆرێ وەک بڵێی «خەونی خۆش، خانوێکی خەیاڵی» چونکە خەریکبوون بەو تەفسیلاتە گەلیک دوورمان دەخاتەوە لە ئەسڵی بابەت. مەبەس شیکردنەوەی داڕشتنی ئیسمی مەعنایە لە ئاوەڵناو. تەنانەت خۆش لەوە ناگەیەنم داخوا ئیصطلاحی «اسم المعنی – معنای مطلق – تجرید - Abstruct » کامیان پەسەندتر و ڕاستتر و گونجاوترە لەگەڵ واتای ئەو سیغەیە کە قسەی لێ دەکەین. لە مەکتەبی سەرەتاییەوە فێرکراین بڵێین «اسم المعنی Abstruct noun» و «اسم المادة marterial noun» منیش هەر ئەو دوو زاراوەم خستۆتە ئیستیعمالەوە لەم نووسینەمدا، لێشیان

ناڕازی نیم چونکە بۆ هەڵوەستی ئێستاکەمان و تا بڕیارێکی گشتی دەدرێ بە جۆرێکی دیکە، خزمەتی مەبەس دەکەن و واتای ویستراو ڕادەگەیەنن.

ڕێی باس کردنی بەشی سێیەم، وەک من بۆ باسەکە دەچم و تێیگەیوم، هەموارتر و بێ کۆسپترە لە دوانەکەی دی. ڕچەی ئەم نووسینە دەری دەخا یەکەم و دوەم گیروگرفت و دەمەتەقەی زۆرە، ڕەنگە باری وای تێدا بێ سەلماندن و نەسەلماندنی نیواونیو بێ.

با لە ئاوەڵناوەوە دەست پێ بکەین. بە جۆرێکی پێشەکی دەڵێم هەموو ئەو ئاوەڵناوانەی بە پیتە دەنگدارەکان کۆتاییان هاتووە وەک «جوان، بەرز، خۆش...» ئیسمی مەعنایان لێ وەردەگیرێ بە ئیزافەی «ی» واتە یێ تیژ لە کۆتایی وشەکەدا. تەنانەت ئەگەر دوو پیتی «و، ی» یش دەنگداربوون و کەوتنە کۆتایی وشەوە، دەستوورەکە ناگۆڕێ. دەڵێی: «جوان، جوانیی – ڕێک، ڕێکیی – دزێو، دزێویی – خاو، خاویی – هێژای، هێژاییی» بەڵام کە کۆتایی وشە پیتەبزوێنی «ا، و، ۆ، ێ، ە» بوو وەک وشەی «ئازا، دوڕوو، دەستەمۆ، کرمێ، ڕووتە» ئەوسا پیتە «ی» ی دەنگدار دەکەی بە پەیوەندی میانی ئەو پیتە بزوێنانە و پیتە بزوێن «ی» چونکە مەعلوومە پیتە بزوێن ناچێتە سەر بزوێنێکی دیکە، ئیتر دەگوترێ «ئازایی، دوڕوویی، دەستەمۆیی، کرمێ یی، ڕووتەیی» . لە بیرت بی هاتنە ناوی «ی» ی دەنگدار لێرەدا ئەویش جۆرێکە لە بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا و بەڵگەیێکە بۆ سەپاندنی ئەوە کە پیتی «ی» لەبەر سروشتی نەرم و شلی زوو دێتە ناوەوە. لەو هەموو پیتانەی ئەلف و بێی کوردی پیتی «ی» مان هێناو کردمانە پەیوەندی میانی وشەکان و پیتە بزوێنی «ی» ئیسمی مەعناو نەمان گوت «ئازاویی، دوڕووتیی، دەستەمۆلیی، کرمۆفیی، ڕووتەکیی». لێرەشدا ئەوە دەڵێمەوە ئەگەر کۆتایی ئاوەڵناو پیتە بزوێنی «ی» واتە یێ تیژ بوو وەک «برسیی، تەژیی» ئیسمە مەعناکە دەبێتە «برسیەتیی، تەژیەتیی». لەبەر زێدە قورسی ناگوترێ «برسی یی، تەژی یی» ناشکرێ «ی» کەی ئیسمی مەعنا لەناو بچێ لەبەر

هۆیەکی یەکجار گرینگ کە فیترەتی هەستیاری خاوەندی زمانەکە ڕەچاوی کردووە. هۆیەکەش ئەمەیە:

تۆ ئەگەر ئیسمی مەعنات داڕشت لە وشەی وەک «برسیی» بە زیاد کردنی «ی» لە کۆتایی وشەکەدا ئەوسا بە پێی قاعیدە و لەبەر زەحمەتی درکاندن «تلفظ» ێیەکە وەک هی شەخسی سێیەم و وەسف و ئیزافە لە گوتندا خۆ بەدەرناخا و تێدەچێ. بەو جۆرە وشەکە وەک خۆی دەمێنێتەوە و هەر دەگوترێ «برسیی». دەوجا وشەی «برسیی» بە مانای «جایع» لەگەڵ «برسیی» بە مانای «جوع» تێکەڵ دەبن و جیاکردنەوەیان زەحمەت دەبێ هەندێ جاریش هەر جیا ناکرێنەوە. کە گوتت «برسیی ناخۆشە یاخود گوتت وەی برسیی چەند دڕی!» بۆت مەعلووم نەکرا مەبەست «جائع – برسیی» بوو یاخود «جوع – برسیەتیی» بوو. بەمەدا دیار دەکەوێ کورد سیغەیێکی تایبەتیی هێناوە بۆ ئەو تەرزە وشانە تا لە چەڵەمەی تێکەڵبوونی مانای جیا جیا ڕزگار بێ. لە قرتان و تێچوونی «ی» ی شەخسی دوەم و سێیەم و ئیزافە و وەسف ترسی ئەو تێکەڵپێکەڵیە لە گۆڕێدا نیە، تۆ کە گوتت «ترۆزیی ناسک، ترۆزیی شارەزوور» هەر یەک واتا دێتە مێشکی گوێگرەوە بۆیە لزوم نیە بڵێی «ترۆزیەتیی ناسک، ترۆزیەتیی شارەزوور» هەر بۆیەیشە لە نووسینیشدا هیچ لزومێک نیە «ی» مردوو بە دوا «ترۆزیی» دا قەتارکەی. دەربارەی ئەم مەوزووعە هەندێ ڕۆشنبیری زل بۆ لایەنگیریی کردن لە نووسینی «ترۆزیی ی ناسک» دەڵێن و خۆیشم لێم بیستوون ئەگەر «ی» ی ئیزافە نەنووسرێ «ئازادی ئامۆزام – ازاد ابن عمی» جیاواز ناکرێتەوە لە «ئازادی گەل – حریة الشعب». بۆ ڕەواندنەوەی ئەم تەگەرەیە وەڵامی قەناعەتبەخش هەیە، جارێ با ئەوە بڵێم تۆ ئەگەر بە نووسینیش چارێکت کرد ئەی لە قسە کردن چ دەکەی؟ لێرەدا قسەیێکی پێشووم دووبارە کردوە... بە ناچاری.

لە ڕاستیشدا ترسی تێکەڵی و سەرشێوان نیە چونکە «ی» ی ئیسمی مەعنا گەلێک درێژترە لە «ی» ئیزافە و وەسف، واتە «ی» کەی «ئازادی-

گەل» فەرقێکی زۆری هەیە لەگەڵ «ی» کەی «ئازادی ئامۆزام». من لە نووسیندا ئەم دوو «ی» یە بە پێی درێژیی و کورتییان لە یەکدییان جیا دەکەمەوە وەک دیتت نووسیومە «ئازادی- گەل – ئازادی ئامۆزام» هەرواش دەنووسم تا بڕیارێک دەردەچێ بە جۆرێکی دیکە بنووسرێ[4].

«ی» ئیسمی مەعنا بە قەد هی نیسبەت و هەموو ئەو «ی» یە ئەسڵییانە کە دەکەونە کۆتایی وشەوە درێژایی هەیە. کە دەڵێی «هەولێریی، جوانیی، ترۆزیی، شایی»، ییێەکان بەقەدەر یەکدین. بەڵام کە دەڵێی «خەڵقی شارەزوور» ئەم ییێەی ئیزافەی دوای شارەزوور بە ئانقەست نەبێ درێژ ناکرێتەوە. هەروەهاش کە دەڵێی «بەردی ڕەق».

وردبوونەوەیێکی دیکەش هەیە لەم باسەدا زیاتر چاومان دەکاتەوە بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت و شارەزاتریشمان دەکا لە هەندێ باری سەلیقەی کورد کە زمانەکەی پێ داناوە و بەمەدا جارێکی دیکەش بۆمان ئاشکرا دەبێ کەوا «ی» ی وەسف و ئیزافە و شەخسی یەکەم و دوەم و سێیەم ناچنە ڕیزی «ی» نیسبەت و ئیسمی مەعناوە.

لەو میسالانەی لێرە بە پێشەوە بە پێی پێویست هێنامانەوە بۆمان دەرکەوت کەوا «ی» ی ئیسمی مەعنا و نیسبەت سەرڕای ئەوە کە درێژن تا لە ئیمکانیشدا بێ هەر بە درێژی دەمێننەوە. وەک دیتمان کە دەکەونە دوای پیتە بزوێنەکان «ی» یەکی پەیوەندی دەکەوێتە میانیانەوە هەتا مومکین بێ تەلەفوزیان پێ بکرێ و بە درێژی بمێننەوە. دەڵیی «بەغدایی، شنۆیی، شەقلاوەیی»... بۆ نیسبەت، «دارایی، فیرۆیی، گەورەیی».... بۆ ئیسمی مەعنا. بەڵام «ی» یەکانی شەخسی یەکەم و دووەم و سێیەم و وەسف و ئیزافە کە دەکەونە دوای پیتەبزوێن بۆ خۆیان لە بزوێنی دەکەون و دەبنە دەنگدار Consonant واتە «ی» پەیوەندی نایێ و بیان پارێزێ. دەڵێی «هەرای پار، خانەی بارام، سەکۆی دوکان، پشووی ئاشتیی، جێی من.... بۆ ئیزافە –

هەرای گەورە، خانەی بچووک، سەکۆی بڵند، پشووی درێژ، جێی دوور... بۆ وەسف»، یاخود دەڵێی «خەیات درووی، قەساب گرووی.. بۆ شەخسی سێیەم» هەروەها «ی» ی شەخسی سێیەم کە چوە دوای مەفعولێک پیتی کۆتایی بزوێن بێ بۆ خۆی لە بزوێنی دەکەوێ دەڵێی «کردی... هەرای کرد، هەڵەی کرد، درۆی کرد... هتاد» بەمەدا جارێکی دیکەش بۆمان مەعلووم دەبێ «ی» ی ئیزافە و وەسف و شەخسی یەکەم و دوەم و سێیەم ناچنە تای تەرازووی «ی» ی نیسبەت و ئیسمی مەعناوە. دەوجا «ی» یەک کورتتر بوو لە یەکێکی دیکە و بە پێی کورتی و درێژی لە نووسیندا جیاکرانەوە بۆ دەبێ «ی» یەکی مردو زیندوکرێتەوە؟  کوا تێکەڵبوونی مەعناو سەرلێشێوان. کە ویستت بڵێی «أوز أبيض» بنووسە «قازی سپی» کە ویستت بڵێی «القاضی العالم، القاضی البصرة» بنووسە «قازیی زانا، قازیی بەسرە».

«ی» ی وشەی «قازیی» یێیەکی درێژە بەوە فەرق ناکا «ی» ی ئیزافە و وەسفی بە دوادا بێ یا نەیێ. چ بڵێی «قازیی هات، قازیی لێرەیە، قازیی زانایە. لێرەدا وشەی قازیی «مبتدأ»ە یێی وەسف و ئیزافەش لە دوا «مبتدأ» ەوە نایەن» چ بڵێی «قازیی بەسرە، قازیی زانا» لە هەموو حاڵاندا «ی» کەی وشەی «قازیی» فەرق ناکا لەلایەن کورتیی و درێژییەوە ئیتر بۆ دەبێ بسەلمێنین ڕێزمان داوا دەکا بنووسرێ «قازیی زانایە، قازیی هات، قازیی ی زانا، قازیی ی کفریی» بۆ عینادی نەبێ وەڵامێک نیە.

دیتت گوتم تا لە ئیمکانیش دابێ هەر بە درێژیی دەمێننەوە، ئەمەم بۆیە گوت چونکە وادەبێ ئەو ئیمکانە وەزەحمەت دەکەوێ. «ی» ی نیسبەت و ئیسمی مەعنا «لە ڕاستیدا هەموو یێیەکی تیژی کۆتایی وشە وەک هی نیسبەت و ئیسمی مەعنا» کە «ان» ی جمعی بە دوا هات ئەو درێژیەی نامێنێ. دەڵێی «ڕاستیی – ڕاستییمان گوت، ڕاستییتان گوت» بەڵام کە ویستت بۆ جمعی غائیب بێ دەڵێی «ڕاستییان گوت». هەرچەند نووسەران

لە نووسینی ئەم سیغەیە یەک جۆر نانووسن وا هەیە دەنووسێ «ڕاستیی یان، ڕاستی یان» بەڵام ئەوەی بە زار دەگوترێ شتێکە کەوا «ی» کەی «ڕاستیی» درێژایی خۆی دۆڕاندووە. هەروەها دەڵێی «ترۆزییان خوارد» لێرەشدا «ی» کەی «ترۆزیی» کورت بۆتەوە. هەمان شکڵ کە پیتە بزوێنی «ە» کەوتە دوا ئەم «یی» یە درێژانە کورتیان دەکاتەوە، دەڵێی «ئەم ترۆزییە» لە گوتندا ناڵێی «ئەم تەرۆزیی یە» هەرچەند بە نووسین واشی بنووسی « ئەم لاباسە درێژەی زیاتر تێدایە، بەڵام بەوەندە وازم لێی هێنا». ئا ئەم موشکیلەیەش یەکێکە لەو گرفتانە کە دەبێ بڕیارێکی گشتیی بۆ بدرێ تا ڕێنووسەکە ببێ بە یەک شکڵ و لەسەر بنچینەیێکی ڕاستیش هەڵستابێ.

تا ئێرە کاریکی کورد کردوەتی کاریکی عادەتییە. لە مادەی «برسییەتیی» و وردەکاریی جیاکردنەوەی «ی» ی درێژ و کورت نەبێ کە زێدە ژیریێکی تێدایە، دەستوورەکانی دیکە هاوتای ئەو دەستوورانەن لە زۆر زمانی بێگانەدا ڕەچاو دەکرێن. بەڵام کورد هەنگاوێکی یەکجار پسپۆڕانەی هاویشتووە لە داڕشتنی جۆرێک ئیسمی مەعنادا پلەیێکی بەرز ژووررووی ئەو پلە سەرەتاییە کەوتووە کە کورد و غەیری کورد تێیدا هاوبەشن. لەم هەنگاوەدا مەبەسێکی پێک هێناوە لە زمانەکانی دیکە هۆی پێک هێنانیان نایەتە بەرچاو یاخود نەهاتۆتە بەرچاوی من. با بزانین ئەم هەنگاوە چییە بەولای داڕشتنی ئیسمی مەعنای عادەتییەوە.!

تاقمێک هەن لە ئاوەڵناو سەرڕای ئیسمی مەعنای عادەتیی کە تازە باسمان کرد، جۆرێکی دیکەی ئیسمی مەعنایان لێ دادەڕشترێ واتایان خۆ جیاواز دەکاتەوە لە واتای جۆرەکەی عادەتیی بەهۆی ئەمرازێکی تایبەتییەوە. سرنجت بدە ئەم کۆمەڵە وشانە و ئیسمی مەعناکەیان. دەڵێی «خۆش، خۆشیی - جوان، جوانیی — کۆن، کۆنیی — ڕێک، ڕێکیی — نوێ، نوێیی». بە دوا ئەمانەدا دیقەت لەم وشانە و دوو جۆری ئیسمی مەعناکەیان بگرە.

دەڵێی «درێژی، درێژیی، درێژایی — پان، پانیی، پانایی — قوڵ، قوڵیی، قوڵایی — ڕەش، ڕەشیی، ڕەشایی هەموو ڕەنگەکان وەک ڕەش وان — قورس، قورسیی، قورسایی — شیرن، شیرنیی، شیرنایی هەموو تامەکان وەک شیرن وان — ڕاست، ڕاستیی، ڕاستایی...». لێرەدا وەک دەبینی و بە پێی ڕای خۆم بۆشت شەرح دەدەم وردبینییەکیی تا بڵێی زیرەکانە دێتە بەرچاو لە کاری فەیلەسووفی زمان دەکا زیاتر لەوەی زادەی سەلیقەی میللەتێک بێ. سرنج دەری دەخا هەموو ئەو مەعنایانەی بە جۆرێک تەحدید دەکرێن «وەک بە مەساحە و پێوان و هەڵکێشان» یاخود هەستێکی مادیی تەواویان پێ دەکرێ «وەک تام کردن و دەست لێ دان»، ئا ئەو مەعنایانە هەڵدەگرن لە موتڵەق داببڕێن و مقداریان دیاریی بکرێ، بۆ ئەم تەحدید و دابڕینەش پیتی «ی» بە کەڵک نایێ چونکە بۆ موتڵەق بە کار دێ و ناتوانی هەنگاوێکی دیکە بەولای موتڵەقەوە بڕوا، ئیتر زیرەکیی و فیتری و هەستیی عەفەویی ڕاست کوردی بۆ ئەوە بردوە سیغەیێکی تایبەتی «وێچوو» پەیدا کا مەبەس ڕاگەیەنێ، ئەم سیغەیەش بە ئیزافەی «ایی» نەک تەنها «یی» پەیدا بووە.

کە گوتت «پانیی» بەوەدا «عرض» ی موتڵەق ڕادەگەینێ بەڵام کە گوتت «پانایی ژوورەکە» مەبەستت ئەو هەندە مەسافە تەحدید کراوەیە کە لەو دیوار بۆ دیوارەکەی بەرانبەری دەگرێتەوە، ئەو هەندە مەسافە لە «موتڵەق» ی واتای «پانیی» دادەبڕێ. هەروەها درێژیی «موتڵەقی طول»ە بەڵام درێژایی هەندێکی تەحدید کراوە لەو درێژییە. وشەی «ڕاستیی» کە لە ڕاست داڕشتراوە مانای «استقامة» یە بەڵام ڕاستایی میقدارێک ڕێگا وەیا زەوی ڕاست و بێ خواریی و نزمییە. ڕاستایی بۆ قسە و بیروباوەڕ نابێ چونکە لەمانەدا تەحدید تەصور ناکرێ. زەردیی مانای «صفرە»یە بەڵام زەردایی ئەوەندە ڕەنگە زەردەیە کە لەسەر شتێک بەجێ دەمێنێ لە نەتیجەی دانانی بۆیاغی زەرد لەسەر ئەو شتەدا، یاخود ئەو میقدارە ڕوناکیەیە کە چاوێکی زەعیف دەیبینێ ئیتر دەگوترێ «چاوی فڵانەکەس کوێر نەبووە زەردایی دەکا». کە گوتت «ڕەشایی» مەبەست میقدارێکی دیارکراوە لە «ڕەشیی»

وەک ڕەشایی زەلام لە شەودا یاخود ڕەشایی خەڵووز کە لەسەر جێگەیەک دەمێنێتەوە. «ترشیی» بەرانبەری «حموضیة»، بەڵام «ترشایی» ئەو تامەیە کە بە زمان دەیچێژیی بۆیە دەگوترێ «ترشایی سماق زیاترە یا کەمترە لە هی لیموندزی». هەروەها شیرنایی و تاڵایی و تفتایی میقدارێکن لە شیرنیی و تاڵیی و تفتیی. لە پێنج هەستەی «حواس خمس» ئادەمیزاد تەنها بۆ هەستی چێشتن و «لمس» کە لەگەڵ مادە تێکەڵ دەبن وەیا بەیەک دەگەن «بەیەکگەیشتنی مادە لەگەڵ مادە» ئەم سیغەیە بەکاردێ ئەوەی دەدیترێ و بۆن دەکرێ و دەبیسترێ بە ڕادەی چێشتن و دەس لێدان «لمس» هەستی مادییان پێ ناکرێ بۆیە ئەم سیغەیان لێناوەشێتەوە. ناگوترێ «جوانایی و درۆزنایی و دەنگخۆشایی و بێنخۆشایی». دیارە ئەو مانایەی کە هەر بە زیهن دەزانرێ بە جارێک لەوە دوورە «ای» بۆ بەکار بێ «ڕەزیلیی و حەقپەرستیی و نیشتمانپەروەیی و هەموو مانایێکی زیهنیی وەک ئەمانە» لە سیغەی عادەتی بەولاوەیان نیە. ئەمە دەستوورێکی گشتییە، بەڵام ئەگەر وابوو یەک لەو هەستانەی بەر دیتن و بیستن و بێن کردن دەکەوێ مومکین بوو تەحدید بکرێ وەیا گەیشتە پایەی مادییەت لە هەست پێکردنییدا ئەوسا قاعیدەکە دەیگرێتەوە. بۆ میسال دەڵێم بۆنێک کە زۆر کەسکوون بوو تا وای لێ هات ببێ بە خزمی تام کردن وشەی «تیژایی» بۆ بەکار دێ وەک «تیژایی بۆنی بیبەر» زاتەن تیژایی بۆ تام کردنە. هەروەها ئەو میقدارە ڕوناکییەی کە لە درزێکەوە دەدیترێ پێی دەگوترێ ڕووناکایی چونکە تەحدیدی تێدایە. لە ڕووناکایی ڕۆژیشدا تەحدید هەیە چونکە دەوەستێ بەرانبەر تاریکایی وەیا تاریکایی شەو. واتا هەر یەکەیان لە ڕێی مقابەلە لەگەڵ ئەوی تردا تەحدید پەیدا دەکەن و لە موتڵەق دەپچڕێتەوە.

لێرەدا با جارێکی دیکەش سەر لە «سپیی، سپیەتیی، سپیایی» خوار کەینەوە. بۆ مانای موتڵەقی «بیاض» سپیەتیی بەکار دێ و لیرە بە پێشەوە گوتمان ئەو سیغەیە بۆیە هاتۆتە ناو نەوەک «بیاض و ابیض» تێکەڵ بن. دەبینین سیغەی «سپیایی» ش هەیە بەڵام وەنیە وەک سپیەتیی بێ مانای

«بیاض»ی موتڵەق بگەیەنێ. دەڵێی «ئەمە سپیایی گەچەکەیە یاخود سپیایی بەفرەکە لە دورەوە دیارە» مەعلوومە گەچەکە و بەفرەکە دو شتی مەحدودە بۆیە گوترا سپیایی نەک سپیەتیی. هەر بۆیەیشە بە «شیر و ماس و ڕۆن و پەنیر و دۆ» ش دەڵێن سپیایی چونکە ئەمانە سەرڕای ڕەنگی سپیاییان مەحدودن و دەشخورێن.

ئەم سیغەیە جگە لە زەکاوەتی جیاکردنەوەی «محدود» لە «موتڵەق»، لە لایەنی داڕشتنیشەوە زەکای تێدایە، پیتی «ی» کە پیتێکی نەرم و شلە و لەسەر زمان سوکە لایقە ببێ بە ئەمڕازی داڕشتنی مانای موتڵەق لە ئاوەڵناوەوە کە ئەویش خۆی لە خۆیدا مادیەتیی تێدا نیە، ئەمە بە جۆرێکی گشتی. بەڵام ئاوەڵناوێک کە هەستی مادیی پێ بکرێ لە ڕێی تام کردن و دەست لێدانەوە، وەیا قابلیتی تەحدید و پێوان و کێشانی هەبێ «کە هەمووی کرداری مادین» دەبێ کارێکی سەختتری لەگەڵدا بکرێ بۆ ئەوە ئەو مەعنایە تەحدید کراوە ببەخشێ. «ی» ی تەنها کوڕی ئەو مەیدانە و هەڵگری ئەو بارە نیە بۆیە ئەمڕازێکی نیسبەت بەو قورسی بۆ بەکار هاتووە کە سێ پیتی «ایی» یە. بە پێی گرنگبوونی داڕشتنی ئیسمی مەعناکە ئەمڕازەکەش گۆڕاوە بۆ درێژتریی. «ی» لایقە بۆ واتای موتڵەق. «ایی» لایقە بۆ دابڕین و بەرەو مادییەت بردنی ئەو میقدارەی کە لە موتڵەقەکە دەپچڕێتەوە. ئەوەش دێتە بەرچاو کە پیتی «ا» ش وەک «ی» نەرم و شلە لەگەڵ سروشتی ئاوەڵناودا دەگونجێ دەوجا هەر وەک ئەمڕازی «ی» ی وشەی «پانیی» هەم ڕێک دێ لەگەڵ «پان» کە ئاوەڵناوە و هەم بەسیشە بۆ وەرگرتنی مانای موتڵەق، ئەمڕازی «ایی» ش ڕیک دێ لەگەڵیدا و بەسیشە بۆ دابڕینی هەندێک مسافە لە موتڵەقی «پانایی» و پێکهێنانی ئەو مادییەتە کە لە وشەی «پانایی» دا ڕەچاو دەکرێ. ئەو تێبینییە دەمێنێتەوە کە بڵێم لە سێ پیتی «ایی» ئەلفەکە و یێکەی کۆتایی بنچینەیین و ویێکەی بەینیان ئاڵقەی پەیوەندییە چونکە وەک گوتمان لێرە بە پێشەوە پیتەبزوێن ناچێتە سەر پیتەبزوێن ئەگەر یەکێکی دەنگدار نەکەوێتە بەینیانەوە.

بەر لەوە بگوێزمەوە بۆ دارِشتنی ئیسمی مەعنا لە دوو جۆرەکەی دیکەی ئیسمی مادە دەمەوێ هەندێک لەسەر وشەی گەرم و سارد و گەرما و سەرما بدوێم چونکە دارِشتنی ئیسمی مەعنا لەم وشانەدا گرێوگاڵی تێدایە پێویستە بە قەدەر حاڵ ڕوونبکرێتەوە. لە وشەی «گەرمایی» دا زیهن بۆ ئەوە دەڕوا لە «گەرما» وەرگیرابێ. بەڵام وردبوونەوە دەریدەخا لە وشەی «گەرم» وە هاتووە نەک «گەرما». کە دەڵێی «گەرمایی» ئاگرم بۆ هات دیارە مەبەست میقداری هەست پێکراوی «گەرمیی» ئاگرەکەیە نەک «گەرما» ی ئاگرەکە چونکە مەعلوومە ناگوترێ ئاگر گەرمایە، کەواتە نابێ «گەرمایی ئاگر» لە «گەرمای ئاگر» ەوە هاتبێ. دەگوترێ ئاگر گەرمە دەوجا بە پێی دەستووری باسلێکراوی لێرە بە پێشەوە «گەرم، گەرمیی، گەرمایی» دارِشتنێکی ڕاست و دروستە و سەرپێچیی تێدا ناکرێ و دەگوترێ «گەرمایی خوێن وەیا ئاگر وەیا ڕۆژ»... هتاد. دیققەتە بگرە لە وشەی «سەرما» ئەم «ما» یەی کۆتایی وشەکە لە ئەسڵدا وجودی نیە. نەک «ما» بەڵکو پیتی «م» یش هەر وجودی نیە چونکە مەعلوومە ئەسڵەکە وشەی «سارد» ە. کەواتە لە ڕێبازێکەوە کە تا ئێستا نازانین «با بڵێم من نازانم» سەر ڕشتەکەی چیە ئەم «ما» یە بۆ سارد و گەرم  هاتووە و کردوونتی بە «گەرما و سەرما». بە پێی قیاس دەبێ بە ئەسڵ «ساردما و گەرم ما» بووبن و کورت کرابنەوە بۆ مەبەسی ئاسانی تەلەفوز. لە بەکارهێناندا سەرما و گەرما جارێکیان وەک ئاوەڵناو خۆ دەنوێنن و جارێکیان وەک ئیسمی مەعنا. کە دەڵێی «ئەورِۆ سەرمایە یا گەرمایە» لێرەدا ئاوەڵناون وەک ئەوەیە بڵێی «ئەورِۆ خۆشە یا فێنکە یا ساردە یا گەرمە». کە دەڵێی «سەرما و گەرمای دوێنێ» هەردوویان لە ئاوەڵناوی دەشۆرێن دەبنە ئیسمی مەعنا و واتاکەیان دەبێتە «ساردی و گەرمی». مەیلم بۆ ئەوە دەڕوا کە لە ئەسڵدا هەردوویان ئیسمی مەعنا بووبن بەڵام لە ڕێی «مجاز» ەوە بە مروری کات وەک ئاوەڵناو بەکار هاتبن. دیققەت بگرە کە دەڵێی «سەرمامە یا گەرمامە» بەو جۆرە لە کاری دێنی کە بڵێی «خۆشیمە یا شادیمە یا

ناخۆشیمە» مەعلوومە «خۆشی و شادی و ناخۆشی» هەموویان ئیسمی مەعنان.

دەڵێی «ساردایی بەفرەکەم هەست پی کرد» ناڵێی «سەرمایی بەفرەکە» مەبەستیش ئەو میقدارە ساردییەیە کە لە بەفرەکەوە هەڵدەستێ، لە هەندێ ناوچەکانی کوردستان دەگوترێ «ساردایی هاتۆتە بازاڕ» مەبەس لەو ساردایییە بەفر و شەربەت و ماستاو و خواردنەوەی هاوینییە هەروەک مەبەس لە «سپیایی» شیر و ماست و کەرە و هاوڕێکانیەتی.

بۆ دارِشتنی ئیسمی مەعنا لە دوو جۆرە ناوەکانی دیکە دوو سیغە هەن یەکیان بە زیاد کردنی «ەتیی» ئەوی دی بە زیاد کردنی «ایەتیی» لە کۆتایی وشەدا. بە پێی ئەوە ئەمرِازی قورس لایقترە بۆ وشە و واتای قورس دەبوا «ایەتی» بەکارهاتبا لەگەڵ ئیسمی مادەی تەواودا وەک بەرد و دار و ئاسن و چیا. دەمایەوە «ەتیی» بۆ جۆرەکەی دی. بەڵام وا دەردەکەوێ لە ڕێی «استقراء» ەوە مانەوەی زمانی کوردی بە بێ نووسین و بۆ ماوەی هەزاران ساڵ وای کردووە ئەو دەستوورانەی لە یەکدی نزیکن تێکەڵ بەیەکدی ببن و یەکیان لە جێی ئەوی دی بەکار بێ. هەڵبەت ئەمەش شتێکی سەیر نیە. بەڵکو ڕوونەدانی سەیرە. تۆ بنوارە زمانی عەرەبی لەگەڵ ئەوەشدا کە 1300 ساڵ زیاترە بەهۆی قورئان و بە دوا قورئاندا بەهۆی نووسینەوە ڕێزمانی پارێزراوە و لە زۆر بنگەی خوێندن و ڕۆشنبیرییدا هەر بەو زمانە ڕێزمانیە وتووێژ کراوە دیسانەوە زمانی قسە پێ کردنی عەرەب نە خزمایەتییێکی ماوە لەگەڵ ڕێزمان نە هیچ لەهجەییێکی بە لەهجەییێکی تری دەچێ. ئەگەر قیاسی کوردی لە عەرەبی بکەین، دوورکەوتنەوەی زمانی ئاخاوتنی کوردی لە ڕێزمانی نبچینەیی گەلێک کەمترە لە هی عەرەبی. واتە زمانی وتووێژی کوردی نزیکترە لە دەستوور و ڕێزمان تا عەرەبی. شتێکی مەعلوومیشە لە ڕێزماندا ئەو بەشەی وردی و جۆرجۆریی تێدا بێ ئامادەترە بۆ گۆڕان و تێکەڵبوون، وەک کڵافەی هۆندنەوە تا داوەکانی باریکتر بن زووتر

دەئاڵۆزێ و درەنگتر گرێکانی دەکرێنەوە. بەو پێیە دەبێ لە کوردییدا بە ئەسڵ دارشتنیی ئیسمی مەعنا لەسەر بناخەیێکی زۆر مەحکەم هەستابێ چونکە تا ئێستاش شوێنەواری کوێرنەبۆتەوە و هەموو سیغەکانی یا شەقامێکی ئاشکرا یا ڕێچکۆڵەیێکی دیاری هەر ماوە. وەک لە میسالاندا دیتمان چوار سیغە هەن بۆ ئیسمی مەعنا بە زیاد کردنی «یی، ایی، ەتیی، ایەتیی» لە کۆتایی وشەدا.

هەریەک لەو سیغانەش بۆ مەبەس و مانایەکی تایبەتیی بەکار دێن. لەو زمانانەی کە من شتێکیان لێ دەزانم یەکێکیان ئەو وردەکارییەی تێدا نیە لەو مەیدانەدا. هەرچەند ئەو ڕایەی لێرە بە دواوە دەربارەی ئەو مەوزوعە دەری دەبرم بەشێکی لە تەخمینەوە دێ بەڵام وەنیە تەخمینەکە لە بۆشیەوە هاتبێ یاخود بە پێی هەوەسبازیی بێ. من بۆ ئەوە دەچم کە لە ئەسڵدا ئەمرازی «ەتی» بۆ ئەو ناوانە بوو بێ کە ئیسمی مادەی تەواو نین وەک «ئەندام، قایمقام، مهندس» بەڵکو شتێکن لە بەینی مادە و ئاوەڵناو «وشەی قایمقام و مهندس بۆ میسال دێنمەوە دەنا مەعلوومە لە کوردی کۆندا ئەو وشانە نەبوون». بەو پێیە ئیسمی مەعنایان دەبێتە «ئەندامەتیی، قایمقامەتیی، موهەندیسەتیی». ئەمرازی «ایەتیی» ش بۆ ناوی مادەی تەواو بووبێ وەک «بەرد، زێڕ، زیو» ئیتر گوترابێ «بەردایەتیی، زێڕایەتیی، زیوایەتیی».

لەوانەیە زیهن بۆ ئەوە بچێ کە ئەم سیغانە و بەکارهێنانیان عەرەب گوتەنی «سماعی» ن بەڵام ئەمە دوورە لە قەناعەت چونکە لە «سماعی» دا ئەوەی ڕچەیە «اطراد» بەدی ناکرێ و هەر وشەیەک بە ڕێکەوت بۆ خۆی لە ڕێبازێکەوە ڕۆییوە. دیومە لە ڕێزمانی عەرەبی «استثناء» لە ئەژماری وشە دەستووریەکان زیاتر بووە لەگەڵ ئەمەشدا ڕیزبوونی چەند وشەیێک و لەیەک چوونیان بووە بە بنچینەی دەستوورێک و ئەوەی بەر دەستوور نەکەوتبێ هەرچەند زۆریش بووبێ پێی گوتراوە «استثناء» تەماشاکە لە کوردیدا ئەو وشانەی پەیوەندی شەخسی «وەک خزمایەتی یا جنسیەت» ڕادەگەیەنن زۆربەیان بە «ایەتیی» دەگۆڕێن بۆ ئیسمی مەعنا وەک «خوشکایەتیی، باوکایەتیی، خزمایەتیی، ژنایەتیی، کچایەتیی، کەسایەتیی،

ئامۆزایەتیی، خاڵۆزایەتیی، پورزایەتیی، مێردایەتیی، بە دوا ئەماندا کوردایەتیی، عەرەبایەتیی، تورکایەتیی، عەجەمایەتیی، ئینگلیزایەتیی...» چاوپۆشین لە ڕچەی ئەو هەموو وشانە و چون یەکیەتییان لەوانە نیە بایەخێکی هەبێ چونکە دەستووری زمان بناخەییێکی لەوە بەهێزتری ناوێ تا دەبێ بە دەستوور. بەڵێ ئەم دەستوورەش «استثنا» ی هەیە. وا دەردەکەوێ ئەو وشانەی پیتی «ا» یان تێدا بێ لەبەر نەقۆڵایی کۆبوونەوەی دو «ا» لە وشەیێکدا بە ئەمرازی «ەتی» ئیکتیفا دەکرێ بۆ ئیسمی مەعنایان وەک دەڵێی «پیاو – پیاوەتی» خۆش نیە بڵێی «پیاوایەتیی» لەبەر درێژی و قورسی دەنا دەبوو وەک گوتت «ژنایەتیی» بشڵێی «پیاوایەتیی». یاخود دەڵێی «برایەتیی» کەچی دەبوا بڵێی «برایایەتیی» چونکە ئەلفەکەی کۆتایی وشەی «برا» ئەمرازی «ایەتی» قبوڵ ناکا بێ ئاڵقەی «ی» بەڵام دیارە بۆ کورت کردنەوە وازهێنراوە لەو «ی» یەو ئیکتیفاش کراوە بەیەک لە دوو «ا» کەی «برا» و «ایەتی». هەروەها ناوی گەل کە ئەلفی تێدا بوو ئەویش بە «ەتیی» دەگۆڕێ بۆ ئیسمی مەعنا وەک «ئەڵمان – ئەڵمانەتیی» لەبەر قورسی ناگوترێ «ئەڵمانایەتیی»[5]. ناوی گەلێکیش ئەگەر بە «ی» نیسبەت لە کۆتایی وڵاتەکەدا پەیدا بوو وەک «هۆڵەندەیی، فنلەندەیی، نەرویجیی» ئیسمی مەعنای بە زیاد کردنی «ەتی» دەبێ وەک «هۆڵەندەییەتیی، فنلەندەیەتیی، نەرویجەیەتیی».

لە وشەی «ئیتاڵیا و ئیسپانیا و ئوکرانیا» ناوی وەک ئەمان ئەگەر نیسبەتەکەیان بکەیتە «ئیتالیایی و ئیسپانیایی و ئۆکرانیایی» ئەوا دەبنە «ئیتالیایەتیی و ئیسپانیایەتیی... هتاد» خۆ ئەگەر نیسبەتەکە بکەیتە «ئیتالیی و ئیسپانیی و ئۆکرانیی – کە ئەمە سیغەیێکی عەرەبی زیاترە لە کوردی» ئەوسا دەڵێی «ئیتالیەتیی و ئیسپانیەتیی... هتاد» ئەوەش تێبینی دەکرێ ئەگەر وشەی وەک «خۆیی» لە نیسبەتدا دوو «ی» ی تێدا بوو بۆ ئیسمی مەعنا دەبێتە «خۆییاتیی» نەک «خۆییایەتیی» دیارە بۆ مەبەسی ئاسانی ئەم «ی» کەی دوایی قرتاوە. بۆیە دەگوترێ «کۆییاتیی». بە پێی قیاس دەبێ

بگوترێ «شنۆییاتیی، هێرۆییاتیی، هەڵشۆییاتیی — کە لە شنۆیی و هێرۆیی و هەڵۆشیی یەوە وەرگیراون».

شتێکی دیکەش سرنج بۆ خۆی ڕادەکێشێ، ناوی ئەو کەسبوکارەی کە مانای ئاوەڵناوی تێدا بەهێز و ئاشکرایە مامڵەتی ئاوەڵناوی لەگەڵدا دەکرێ وەک «سەپانیی، جۆتیاریی، وەستایی، شاگردیی، پاسەوانیی، سەرتاشیی، باغەوانیی، کابانیی... بە قیاس لە مانەوە وشە عەرەبیەکانیش دەبنە، «نەجاڕیی، خەیاتیی، تەباخیی، قەسابیی... هتاد».

بەڵام وەکو گوتم لە ئەنجامی بەکارهێنانی زارەوزاری هەزاران ساڵ و لەبەر نەچەسپاندنی ڕێزمان بە نووسین و تۆمار کردن هەڵبەت تێکەڵبوون پەیدا بووە لە میانی ئەو سیغانە تا وای لێهاتووە سنووری ئاشکرا لە میانی هەندێ لەو سیغانەدا هەڵگیراوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەل نەدۆڕڕاوە بۆ بەربەست کردنی کوێربوونەوەی سنوور و تێکچوونی ڕێزمان. زمانزان و ئەدیبانی کورد دەتوانن بڕیاری ئەوە بدەن کە فلان سیغە بۆ فلان مەعنا بێ. ئەوەندە هەیە کارەکە زۆر ئاسان نیە هەم لەبەر ئەوە وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەییێکی زۆری دەوێ و هەم لەبەر زەحمەتیی «ناڵێم استحالة» ڕێککەوتنی ئەدیبەکانمان لەسەر ڕایەکی هەمەگیی. بێگومان ئەم باسەی دارشتنی ئیسمی مەعنا ئەوەندە فراوانە لەوانە نیە بخرێتە ڕیزی کۆمەڵە باسێک و ببێ بە ئاڵقەی زنجیرەییێک، خۆی بەتەنها ئەوەندەی ئاڵقە تێدایە ببێ بە زنجیرە. بەڵام بە نیسبەت منەوە کە لە ڕۆڵی «ی» بدوێم ناکرێ ئەم باسە هەڵبوێرم. هەرچەند بە جۆرێکی ناتەواو و نیوەچڵیش بێ لێدوانی پێویست بوو، وا دەزانم سوودبەخشیش بوو بێ. کردنەوەی دەروازە لە ژوورێکی مەنفەزبڕاوی زمانەکەمان هەروەک ژوورەکە ڕووناک دەکاتەوە هانیشمان دەدا بۆ کردنەوەی دەیان ژووری وەک ئەو کە تا ئێستا بە داخراوی ماونەوە و جاڵجاڵۆکەی فەرامۆشی شوێنەوار و دروشمی شاردۆتەوە. یەک باوەش خامەی ژیر و دڵسۆز ببن بە گەسک ئەوجا دەتوانن ڕیسی جاڵجاڵۆکە و تۆزی

بێ خزمەتیی لەو ژوورانە بتەکێننەوە. خامەی من ئەگەر بەقەدەر تاکە قەسەلێکی ئەو گسکە هەوڵی ماڵین و تەکاندنی دابێ خۆم زۆر بە بەختیار و سەربڵند دەزانم.

ئەوەی ماوە لە باسەکەم دەربارەی ڕۆڵی «ی» پێویستی بە شەرح و قووڵبوونەوە نیە، ڕەنگە هەر بە ژماردنی جۆری بەکارهێنانی لێی ببینەوە. لە فیعل، بۆ جەمعی قسەکەر «جمع المتکلم» لە ئایندەدا «ین» بەکار دێ وەک «دەخۆین، دەکەین، دەڕۆین، هەڵدەستین». لە فیعلی «بناء مجهول» بۆ مازی «ین»، بۆ ئاینده «ێین» دێتە ناو وشەکە وەک «دیتراین، دەدیترێین – نووسراین، دەنووسرێین – لێدراین، لێدەدرێین». تاقمێک فیعل هەن لە کوردیدا من پێیان دەڵێم «افعال الوقوع ، فیعلی ڕودان» فاعیلەکانیان بە شتێک هەڵناسترن ئەوەی ڕوودەدا لە خۆوە ڕوودەدا وەک «سووتا، دەسووتێ – ڕما، دەڕمێ» کە ئەمە فەرقی نیە لەگەڵ تەصریفی بناء مجهول وەک «دیترا، دەدیترێ». ئەم فیعلانە لە ڕووی کارنەکردنی فاعیلیانەوە زۆر بێهیزن لە عەرەبیدا بەشی زۆریان بەر «افعال المطاوعه» دەکەون. ئاشکرایە بوونی «ا» لە کۆتایی فیعلەکە یارمەتی ئەو بێهێزیەی داوە چونکە خۆی بێهێزە و بەڕەڵلایشە، هەر دەڵێی بەو بێهێزییە و بەڕەڵلاییە فیعلەکە بێ خاوەند ماوەتەوە. کارێکی یەکجار شارەزایانە و ژیرانەیە کە بناء مجهول هەمان سیغەی بۆ بەکار هاتووە، چونکە ئەویش مانای تێپەڕی «تعدیه» دۆڕاندووە و فاعیلەکەی لە وشەدا نادیار بووە. هەندێ «استثناء» لەو تاقمە فیعلەی «ڕودان» ە هەیە وەک لە فیعلی «مردن» دا[6] دەدیترێ. دەبوا بگوترێ «مردا» بۆ شەخسی سێیەم لە مازیدا چونکە شەخسی مردوو بە ئیرادەی خۆی نامرێ، هەڵبەت دەبوا چاوگەکەش «مردان» با وەک «پسان، سووتان...» بەڵام وەک بڵێی گرینگی ڕوودانەکە و زێدە ناخۆشیی کە تێیدایە هێزی بە داڕشتنەکەی داوە.

«هەڵستان» یش ««ڕاوەستان و داوەستانیش خزمی «هەڵستان – هەلوەستان» ن چونکە ئەمانیش فیعلە ڕوتەکەیان لە «وەستان» ەوە هاتووە»»  لە ڕواڵەتدا خۆی بە «استثناء» دەنوێنێ. بەهۆی ئەو «ا» یەی وا لە کۆتایی وشەکەدایە دەبوا ئەویش وەک «ڕمان، خلیسکان...» لە تاقمی فیعلی «ڕودان» بێ کەچی ماناکەشی ڕودان نیە چونکە «هەڵستان» لە خۆوە پەیدا نابێ، بە ویستن و ئیرادە دەکرێ. بەڵام لە ڕاستیدا ئەسڵی «هەڵستان» لە «هەڵوەستان» ەوە هاتوە، ئەویش فیعلە ڕوتەکەی «وەستان» ە. دیارە «وەستان » ماناکەی «لە حەرەکە کەوتنی ناچاری» یە کە فیعلێکی بێهێز ئەم مانایە دەبێ ڕاگەیەنێ.

من بۆ ئەوە دەچم کە فیعلی «نووست» بۆ ئەو نووستنە بێ کە ویستنی لەگەڵدا بێ نەک لە خۆوە بێتە سەر مرۆڤی بەخەبەر.  ئەگەر نووستنەکە بێ ئیرادەی مرۆڤ بێ دەگوترێ «خەوی لێ کەوت». کەواتە «نووست» فیعلێکی بەهێزە، بەڵام فیعلی «بۆرژا» ڕاستە و ڕاست ڕوودانە و سیغەکەشی هەر ئەو سیغەیە.  کە گوتمان «ا» یەکەی فیعلی ڕوودان دەبێتە «ی» لە ئایندەدا «مضارع» دیارە لەو سیغانەدا کە ڕاناوەکەیان «ی» ی تێدایە دەبێ دو «ی» ی تێدا کۆ بێتەوە وەک «برژاین، دەبرژێین – خلیسکایت، دەخلیسکێیت». لەمەشدا دەبێ فیعلەکە هی ڕودان بێ واتە بێهێز بێ. دەنا مەعلوومە لە ئایندەدا دو «ی» کۆ نابنەوە وەک دەڵێی «هەڵستاین، ڕاوەستاین – هەڵدەستین، ڕادەوەستین». بەڵام «وەستان» بۆ خۆی لە هەندێ لەهجەدا وەک فیعلی بێهێز بەکار دێ. دەگوترێ «وەستاین، دەوەستێین» بە مەرجێک مەبەس لە حەرەکە کەوتنی ناچاریی بێ بەهۆی ماندووبوونەوە. هەرچۆنێک بێ «استثنا» لە هەموو دەستوورێکدا هەیە، ئێرەش جێی ئەژماری «استثناء» نیە تا چی دیکەی بە دووکەوین.

لە جۆرێک فیعلی کوردیدا «ی» یەک دێتە ناوەوە «انتقال» دەبەخشێ. دەڵێ «تفەنگێکم گرتە نیشانە»، بەڵام کە مەفعولەکە لە ڕستەدا ون کەی

دەڵێی «تفەنگێکم گرتیۆ». دەڵێی «چوومە ماڵەکە... چومیۆ — نۆڕیمە باغەکە، نۆڕیمیۆ — بوومە مامۆستا، بومیۆ — خونجامە جێگەکە، خونجامیۆ». ئەم «ی» یە کە دەچێتە دوا فیعلەکەوە «بومیۆ، چومیۆ، گرتمیۆ، کەوتمیۆ، نۆڕیمیۆ، خونجامیۆ، دامیۆ، پەسوامیۆ، ترنجامیۆ» ئاوەڵناوی شەخسی سێیەم نیە بەڵکو «ئەمرِاز وەیا پاشگر» ێکە[7] بزووتنەوەکە و ئینتیقالەکە دەبەخشیۆ. ئەم «ی» یە هەمان بزوێنی «ە» یە کە دەکەوێتە دوا فیعلەکەوە لەو ڕستانەدا کە مەفعولیان تێدا دیار دەکریۆ وەک گوتمان و لێرەدا دەڵێینەوە «گرتمە نیشانە، چووینە خانوەکە، نۆڕیمانە باغەکە، کەوتینە خوارەوە...».

یا کە فیعلێکی دیکەش وەک ئەمانەیە لە «تصریف» دا بەڵام واتای کمێک جیاوازە چونکە ئەمیان «جعل» دەگەیەنیۆ لە ڕێی «جعل» ەوە کە گۆڕین وەیا سازدانی تێدایە سەر بە «انتقال» دەگەیەنیۆ. دەڵێم «دارەکەم کردە مێز، تۆ دەکەمە پاڵە، بمانکە وەکیلی خۆت» کە مەفعولەکە ون بوو دەڵێم «کردمیۆ، دەتکەمیۆ، بمانکەییۆ...» دیارە چاوگەی «کردن» بە مەعنای «جعل» دو «مفعولی» دەویۆ ئیمکان هەیە هەر دوویان ون بن یا تەنها یەکێکیان. لە ڕاستیدا بە ئەسڵ «کردن» لەگەڵ «بوون» سروشتێکی تایبەتی کۆیان دەکاتەوە کە ئەویش «پەیدابوونی گۆڕان» ە لە هەردوو فیعلەکەدا هێندە هەیە لە «کردن» دا مەفعول دەگۆڕیۆ، لە «بوون» دا فاعیل دەگۆڕیۆ. دەڵێی «بارامم کردە سەرپاڵە - بارامم کردیۆ» دەشڵێی «بارام بووە سەرپاڵە - بارام بوویيۆ». ئەم سروشتە تایبەتییە کە هەردوویان تێیدا بەشدارن وای کردوە بە جۆرێکی تایبەتیش بەکار بێن کە لە فیعلەکانی دیکە دیار ناکەویۆ. دەڵێی «بارامم کرد بە سەرپاڵە، بارام بوو بە سەرپاڵە». «استثناء» هەیە لەم دەستوورەدا ئەویش لە فیعلی «دان، گەیشتن» چونکە دەتوانی بڵێی «پارەکەم دا بە بارام و گەیشتم بە تۆ» دەشتوانی بڵێی «پارەکەم دایە بارام و گەیشتمە تۆ» ئەگەر هیچ «استثناء» ی دیکە هەبیۆ بە بیرمدا نەهاتووە. لە ڕاستییدا ئەم فیعلانە خۆیان و «استثناء» یان دەبیۆ لە ڕێی «استقراء» ەوە دەسنیشان بکرێن، ئەو هەندەی من لێرەدا نووسیمن هەر بۆ مەبەسی میسال

هێنانەوە بوو. لەم فیعلانەی «بزوتنەوە و گوێستنەوە سازدانە» نەبێ هیچ فیعلێکی دیکە لە کوردیدا ئەم «ئەمراز وەیا پاشگر» انەی بۆ بەکارنایێ. ناگوترێ «خواردمەنان، دەخۆمێ – شوشتمە جلک – دەشۆمێ – شکاندمە بەرد، دەشکێنمێ...».

بەهۆی پەیدابوونی تاو و گوێستنەوە لە شتێکەوە بۆ شتێکی دیکە، یاخود گۆڕانی شتێک بۆ شتێکی دیکە لەم سیغەیەدا، فیعلی تێنەپەڕ وەک تێپەڕی لی دێ، فیعلی تێپەڕیش کار لە دوو «مفعول» دەکا. مەعلوومە «بوون، چوون، کەوتن، هاتن، داهاتن، نۆڕین» فیعلی تێنەپەڕن کەچی کە دەڵێی «هاتمە ژوورێ، داهاتمە تەیرەکە، نۆڕیمە دیمەنەکە، بوویتە بوێژ، کەوتینە ئاوەکەوە، دەچنە ڕاو...» وشەی «ژوور، تەیر، دیمەن، بوێژ، ئاو، ڕاو» جێی مەفعولی گرتۆتەوە. کە دەشڵێی «جلەکەم خستە ئاوەوە، بارام دەکەم سەرپاڵە، بەردێک بگرە چوێلکە، پارەکەیان بردە بانک» دوو مەفعولت هێنایەوە «جل و ئاو – بارام و سەرپاڵە - بەرد و چوێلکە - پارە و بانک» هەر جوتە وشەیێک «مفعولی» فیعلێکن.

ئەوەش دەبێ بزانین هەموو ئەو فیعلانەی لە میسالاندا بەکارمان هێنان سیغەی ئەسڵییان وەک فیعلی دیکە ڕەفتار دەکەن، واتە ئەگەر نەتەوێ بە تایبەتی بۆ ئەم مەبەسەی «ئینتیقال گوێستنەوە....» یان بەکار بێنی، لە خۆیانەوە ئەم کردارە ناکەن. دەڵێی «تازە هاتم – نۆڕیم نەم دۆزیەوە - چوێلکەم گرت – پارەتان برد – هەرچی کاغەز هەبوو خستم – خانوەکە داهات – ماندوو بووین – گەشتی کرد – لەگەڵتان دەخونجێین – کابرا گەیشت...».

تا ئێستا بە تێفکرینێکی کەم ئەم فیعلانەم دۆزیوەتەوە لەم بابەتە بن «خستن، گرتن، بوون، چوون، کەوتن، هاتن، داهاتن، گەیشتن، خونجان، پەسوان، ناردن، هەڵدان – بە مانای تەدەخول لە قسە وەک بڵێی هەڵمەدەیێ، بارام هەڵیدایێ،

کابرا هەڵدەداتێ». فیعلی «هەڵکشان» لەگەڵ دیار کەوتنی «مفعول» ەکە ئەم کارە دەکا دەڵێی «هەڵکشامە سەری شاخەکە» بەڵام ناگوترێ «هەڵکشامێ». باسی فیعلی ئینتیقال لەوە زیاتر پێوستی بە لێکۆڵینەوە و درێژە پێدان هەیە بەڵام لێرەدا مەودا نیە...

ئەم میسالانەی خوارەوە هەندێ جۆری بەکارهێنانی «ی» نیشان دەدەن لەگەڵ پیتی تردا:

1- سپیێنە، ڕەشکێنە، زەردێنە، شلکێنە.
2- سوورێژە، خروێلکە، وەردێنە «ناوی ناساغی».
3- یەکەمین، دوەمین «پلە و ڕوتبە».
4- ئاسنین، زێڕین، زیوین.
5- گڵینە، مسینە.
6- کەمیەنە، زۆرینە، کۆنینە.
7- جوانترین، خۆشترین...
8- خوشکێ، پورێ، دایکێ، کیژێ، حورمێ، کچێ.
«بانگهێشتنی مێینە» لە فۆلکلۆردا هەیە دەڵێ «هێ ڕەوشەنێ، هێ چەلەنگێ پێش قۆشەنێ». ڕەوشەن ناوی ئافرەتە، چەلەنگیش کە بووە بە ئاوەڵناو بۆ ڕەوشەن مامڵەتی مێی لەگەڵدا کراوە.
9- مێینە و نێرینە ڕەنگە بچنە ڕیزی «کەمینە و زۆرینە» نەوەک «گڵینە و مسینە» چونکە تەنها جۆرە «وصف» ێک نیشان دەدەن، وەک گڵینە و مسینە نین دروستکراو بن لە مادەیێک و بەو دروست کردنە پێکهاتبن.
10- جگێنە، موشێنە، هێلکەشکێنە، چەڵەمەشکێنە، کارەمستێنە، تۆپێنە، جغزێنە، هەموو ناوی یاری میللین. لە ناوچەی هەولێر و کۆیێ و هەندێ شوێنی دیکەی کوردستانی خواروو دەگوترێ «جگانێ،

موشانێ، هێلکەشکانێ، چەڵەمەشکانێ، کارەمستانێ، تۆپانێ، جغزانێ...هتاد»

یاریەک هەیە لە پشدەر پێی دەڵێن «دایە مەمدۆڕەکێنە» لە کۆیێ پێی دەڵێن «دونگ لەمەڕێ» ڕاستییەکەی «گورگ لەمەڕێ» یە چونکە لەو یاریەدا گورگ لەمەڕ دەدا و دەیڕفێنێ. لەمەدا دیار دەکەوێ زۆرینەی ناوی یاری لە زمانی کوردییدا بە ئەمڕازێک پێک دێ پیتی «ی» ی تێدایە.

11- ژنانیی، کوڕانیی، کچانیی، و ئاوەڵناوی ئەوتۆیی مانای «کەس» رادەگەیەنێ یا ئافرەت بێ وەک نێر ڕەفتار بکا یا پیاو بێ وەک مێ ڕەفتار بکا. کە گوتت «ژنانە، کچانە، کوڕانە» مانای «کەس» ی تێدایە نامێنێ، بۆ جلک و عادەت و ڕاوێژ بەکار دێ

لە هەندێ لەهجەی کوردیدا دەگوترێ «چوومە ڕەواندزی، ماڵی لە هەولێرێیە، لە بیتوێنێدا ڕاو دەکا، لە شنۆیێ ڕا ڕۆیشت». مامڵەتێکی تایبەتیی لەگەڵ ناوی شاری «کۆ» یەدا کراوە. لە حاڵێکدا کە زەرف و مەفعولیش نیە دەگوترێ «کۆیێ». لە بەکارهێنانی ناوی هیچ شار و ئاواییەکی دیکە ئەم ڕێگەیە نەدراوە. دەڵێی «کۆیێ خۆشە، کۆیێ دیارکەوت» هەرگیز ناگوترێ «شنۆیێ دیارکەوت، ئاکۆیێ عەشرەتە، هەڵشۆیێ دوورە». مەتەڵی کۆن دەڵێ «سەیرە لە کۆیێ»، ئەگەر ئەم مەتەڵە بۆ هەولێر با خەڵقی سلێمانی نەیان دەگوت «سەیرە لە هەولێرێ» دەیانگوت «سەیرە لە هەولێر». وەنیە ناوی شارەکە بە ئەسڵ «کۆیێ» بێ چونکە مەعلوومە ئەسڵەکەی «کۆ» یە. حاجی قادر دەڵێ:

لە مەیدانی بەهارا شارەکەی کۆ
قوبەی کشمیری دابەر شەق وەکو گۆ

لە فۆلکلۆردا هەیە دەڵێ: «هەی گۆ گۆ دەچمە شاری کۆ دێنم دوو لیمۆ».

«ی» لە چووک کردنەوەشدا بەکار دێ. دەگوترێ «جووجە، جووجیلە - جوانوو، جوانیلە - جەوەندە، جەوەندیلە...». لە هەندێ ئاوایی و دێی وڵاتی کۆییدا بۆ خۆم لە توتنەوانم بیستوە گوتویەتی «ماشیلکە، تەماتیلکە، ترۆزیلکە، شوتیلکە». دونگی مەڕ کە لەگەڵ گۆشتی قاورمەدا سوور بۆوە پێی دەڵێن «چزیلک» کە بەلای منەوە وشەیێکی چووک کراوەیە هەرچەند ئەسڵەکەشی نەزانرێ. «پشیلە» ش چوک کرایەوەی «پشیک» ە.

لە «عطف» دا دەچێتە پێش ئەمڕازی «ش» ەوە دەگوترێ «ئەویش، بارامیش، ترۆزیش، دار و بەردیش». بەڵام ڕێی ئەوە هەیە ئەگەر کۆتایی وشە پیتەبزوێنی «ا، ۆ، و، ێ،ە» بوو ئەم «ی» یە بقرتێ وەیا بمێنێ.
دەگوترێ «تۆیش، تۆش — ئێمەیش، ئێمەش — کایش، کاش — پێیش، پێش — نووستویش، نووستوش». هەڵبەت کە کۆتایی وشەی «ی» واتە یێی تیژ بوو ئەم «ی» ەی عەتف بە دیار ناکەوێ لە قسەکردندا وەک دەڵێی «ترۆزیش، برسیش، عەلیش...» ئەوەش دەبێ بڵێم «ی» ی عەتف هێزی «ی» ی ئیسمی مەعنا و نیسبەتی نیە. دیتمان لە میسالاندا کە کەوتە دوای پیتە بزوێن بۆ خۆی لە بزوێنی دەکەوێ و هیچ «ی» ی پەیوەندی نایێ بیپارێزێ، سەرڕای ئەمە کە گوتمان ڕێ هەیە بۆ قرتانیشی. لە هەندێ پێشگردا «ی» خۆ تێکەڵ دەکا وەک «تێگەیشتن، لێگرتن، پێگوتن».

لەگەڵ وشەی «کرم» دا ئاوەڵناوێکی تایبەتیی پەیدا دەکا دەڵێی «دڵی کرمێ بوو، میوەکە کرمێ بوو». بەڵام لەگەڵ هەندی وشە «کەژ، نەرم، گوڵ» ناو پەیدا دەکا بۆ ئافرەت دەگوترێ «کەژێ، نەرمێ، گوڵێ، شەمێ».

«ی» بەشدار دەبێ لە پێکهێنانی چوار ئەمڕاز یەکیان بۆ هاندان «دەی بیکوژە». دوەمیان بۆ سەیر پێهاتن «تعجب» دەگوترێ «وەی چەند خۆشە». سێیەمیان بۆ ناڕەزایی «هەی بێوەفا». چوارەمیان بۆ بانگکردن «ئەی جیهان، ئەی نیشتمان». وشەی «کەی» هەرچەند لە کێشی ئەم چوار ئەمڕازەیە

بەڵام ناوی پرسیارە و ئەمراز نیە لەبەر ئەم «ی» کەی پیتی ئیملایە وەک «ی» هۆشیار، سلێمانی، چێشتن، مەی.

«ی» دەچێتە دوای چەند وشەیێکی وەک «شەو، ڕۆژ، سبەینە» کە پێیان دەگوترێ «ناوی زەرف» دەیانکا بە زەرف و دەیانخاتە ڕیزی «دوێنێ و پێرێ» کە زەرفن و هەر ئەم داڕشتنەشیان هەیە، واتە وەک «شەو، ڕۆژ، چێشتەنگاو» نین ئەسڵێکیان هەبێ و «ی» ی چوبێتە دواوە. دەڵێی «ڕۆژێ دەگەڕێم و شەوێ دەنووم... چێشتەنگاوێ هاتەوە... سبەینێ نامە دەنووسم». ئەم وشانە و گەلێ وشەی دیکە وەک «نیوەڕۆ، مەغریب، عەسر، عیشا، نیوەشەو، بەهار، هاوین، پایز، زستان، ڕۆژهەڵات». یێیان دەچیتەوە دواوە و دەیانکا بە زەرف. «نیوەڕۆیێ گەیشتم، مەغریبێ، عەسرێ، ڕۆژهەڵاتێ دەڕۆم، نیوەشەوێ تێر خەو دەبم، هاوینێ، بەهارێ دەچمە کێو...هتاد». وا دەزانم «ی» دوای وشەی «بەیانێ» یێ نیسبەتە کەچی زەرفیشی دروست کردوە چونکە مانای «سبەینێ» یە بێ زیاد و کەم. وەک وشەی «بەیانی» وشەکانی «شەوەکێ و ڕۆژەکێ و پێشەکێ و پاشەکێ» ش هەر بە هۆی «ی» نیسبەتەوە بوون بە زەرف.

دیسانەوە دەبێ بڵێم سروشتی نەرم و شلی «ی» وای کردوە بەشدار بێ لە پێکهاتنی کۆمەڵێک وشەی دو پیتی وەک «ئێ، بۆ تصدیق»، بێ، بێ شەرم، بێ «میوەی بێ کە کورت کراوەی بەهێیە»، بی «دار بی»، پێ، تێ «تێگرتن»، تی «کەوتە سەرتی»، جێ، چێ «چێ کردن» چی، خێ «بە مانای خوێ» پێویست نیە من هەموو وشەکان بکەمە لیستە و جێگەیان پێ بگرمەوە. خوێنەر دەزانێ بۆ خۆی بە دوا ژماردنیان بکەوێ، هێندە هەیە دەبێ کۆمەڵێک لە ناوی پیتی «هجا» ش بخاتە سەر لیستەکە چونکە ئەمانیش زۆریان لە کوردیدا ناوەکەیان دو پیتییە و کۆتاییان «ی» یە وەک «بێ، تێ، ڕێ، زێ، ژی...هتاد». بەلامەوە نازکیی پیتی «ی» بووە بە مانیع لەوەدا بە دەگمەن نەبێ نەیێتە سەرەتای وشەوە، چونکە پیتی نازک و نەرم و شل لەوە

دەوەشێتەوە دەوری پەیوەندی ببینێ لە میانی پیتاندا، هاتنی لە سەرەتای وشەدا ئەم دەورەی لێ دەسێنێتەوە. سەیرکە لە کاتێکدا کە پیتی «ی» لە ناو ڕستەدا و وشەدا دەنگداریش بێ «واتە بزوێن نەبێ» دیسان تا ڕادەیێک دەوری پەیوەندی دەبینێ وەک دەڵێی «رای کرد، مەی خۆ...».

لێرەدا باسەکەمان کۆتایی دێ هەرچەند نەگەیشتوومە کۆتایی مەوزووع چونکە بێگومان جۆری بەکارهێنانی «ی» لەوەندە خستمە ڕوو زیاترە، گەلێک لە سەرە باسەکانیشی پێویستی بە شیکردنەوەی زیاتر هەیە. تاکە یەک میسال دێنمەوە وەک نموونە بۆ ئەو هەڵبواردنانەی لە ترسی درێژەی وەڕسکەر کەلەبەریان خستۆتە نووسینەکە، بەڵکی لە هەلی ئایندەدا من پڕیان کەمەوە یاخود نووسەری دیکە لێیان بدوێن.

میسالەکە ئەمەیە لە لیستەی ئەو فیعلانەی «انتقال» یان تێدایە فیعلی «نۆڕین» سروشتێکی تایبەتی هەیە کە لە شوێنی خۆیدا لێی نەدوام وەک لە زۆر شتی دیکەی ئەوتۆیی نەدواوم. نۆڕین فیعلێکە هەم تێپەر هەم تێنەپەڕ. فیعلێکی «دو سروشتی» یە. مومکینە نۆڕین بە مانای «دیتن» بێ کە فیعلێکی تێپەڕە مومکینیشە بەو مانایە بێ کە فیعلی «نظر» ەی عەرەبی ڕادەگەیەنێ و بە هۆی «حرفی جر» دەکرێ بە تێپەڕ دەنا بۆ خۆی لە ئەسڵدا تێنەپەڕە. دەگوترێ «خانوەکەم نۆڕی» کە لێرەدا فیعلەکە تێپەڕە وەک ئەوەیە بڵێی «گۆشتم خوارد، خانوەکەم دیت». دەشگوترێ «نۆڕیم کەسم نەدیت» کە ماناکەی تێنەپەڕە وەک ئەوەی کە بڵێی «ڕۆیشتم تا ماندوو بووم، تەماشام کرد نەم دۆزیەوە». هەر ئەم دو «سروشتی» یە وای کردوە کە وەک فیعلی «انتقالی» بەکار دێ یەک «مفعول» ی دەوێ واتە دەبێتە فیعلێکی تێنەپەر «چونکە گوتمان فیعلی تێپەڕ لە حاڵی «انتقالی» دا دوو «مفعول» ی دەوێ» کەچی لە «تصریف» دا وەک فیعلی تێپەڕ «تصریف» دەکرێ. دەڵێی «کردمان، خواردمان، نۆڕیمان». سەیرێکی زۆر سەیرتر ئەوەیەکە بە مانای تێنەپەڕیش بەکار بێ لە «تصریف» دا هەر

وەک تێپەڕ «تصریف دەکرێ». دەڵێی «نۆڕیمان کەسمان نەدیت، نۆڕیمانێ» کە ماناکەی تێنەپەڕە.

لە ڕاستیدا مەبەسی بنچینەیی ئەم باسە کردنەوەی دەرگایەکی نەکراوەیە لە زمانەکەماندا زیاتر لەوە ژماردن و دەورە لێدانی تەواو بێ وەک زەوی بەیار کە پانایی و درێژایی بێ سەروبن بێ لە هەوەڵەوە یەک گاسنی لی دەدرێ بە دوای ئەو شۆبڕینەدا وەرد دەردێتەوە و دەکرێ بە دوو گاسن و سێ گاسن... زمانی کوردیش هێشتا کەمیکی نەبێ نەبووە بە کێڵگەی قەڵەم، بۆیە عوزری نووسەر لە پەلەکردن و ماوە بڕینی خێرا وەک عوزری ئەو جوتیارە چالاکەیە دەیەوێ لە پێشەوە هەموو زەویەکەی شۆ ببڕێ نەکا بورە و بەیاری تێدا بمێنێتەوە. وا بووە وشەیێکی عەرەبیم لە جێگەیێکدا بەکار هێناوە، لە شوێنێکی دیکەدا کوردیەکەم نووسیوە. هەرچەند ئەمە کارێکی زۆر ئەدیبانە و پەسەندیش نیە بەڵام بۆ خۆم چاوی لێ دەپۆشم چونکە «تێگەیاندن» بەلای منەوە لە پێش مەبەسی ئارایش و «کوردیی پەتییەوە» دێ. هۆیەکی دیکەش هەیە بۆ ئەوە بێ پەروا بم لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە کە لەبەر گوێیان ئاشنا بووبێ. «حساسیة» م نیە دژی ئەو تەرزە وشانە. نامەوێ لە تورکێک یا فارسێک یا ئەفغانێک زیاتر کۆمە بکەم لە دەربڕینی واتا بەهۆی وشەی ڕێکوپێکی بێگانە کە واتای تەواو بە دەستەوە دەدەن. تەنها فەرقێک ڕەچاو دەکەم ئەویش ئەوەیە چونکە کوردی تازە بە تازە پێی دەنووسرێ پێویستی زیاترە لە تورکی و فارسی بە ئاشنا کردنی وشە نوێیەکانی لەبەر چاو و گوێی خوێنەری کوردی. دەستیشم نەپاراستوە لەوە جارێکیان وشەی عەرەبیم بە ئیملای کوردی نووسیبێ و جارێکیان ئیملای عەرەبی. واش بووە وشەی کوردیم بە دوو جۆرە ئیملا نووسیوە، چونکە تا ئێستا بڕیارێک نەدراوە جۆرێکی تایبەتی ڕێنووس ببێ بە دەستوور. کە حاڵیش وا بوو پەنجە و قەڵەم ناوناوە ڕێ گۆڕکێ دەکەن. کە سۆز و ڕاستیخوازیی ڕابەری نووسەر بێ هەر چۆنێک دەنووسێ با بنووسێ تا ئەو ڕۆژەی شەقامێکی ئاشکرا قەرارداده دەکرێ.

که جێگەت بۆ عبیادەت بێ چ «فوقانی» چ «تحتانی»
که «حبت» بۆ سیادەت بێ چ بەرزنجی چ باراویی.

زانایانی زمان تەواوێک خەریکبوون، لە کۆنەوە، پتریش خەریک دەبن لە دوارۆژدا ، بۆ دۆزینەوەی بەشەکانی ئاخاوتن بە پێی سروشتی وشە و ئەو ڕۆڵەی پێی هەڵدەستێ لە ڕستەدا. یەکێک بیەوێ زیهنکاریی بکا و دەسەڵاتی زمانزانیش یارمەتی بدا دەتوانێ، بایی قەناعەتی خۆی و بەشێکیش لە خەڵق، بەڵگە بێنێتەوە بۆ ئەو دابەش کردنەی کە خۆی پەسەندی دەکا چونکە بابەتی وەک ئاخاوتن کە بوونێکی مادی نیە بیکا بە مەوزوعی ئەزمونی «امتحان» موختەبەریی و ڕاستیی و هەڵەیی بە تەجرەبە ساغ بکرێتەوە، هەڵدەگرێ هەر یەک لە سەرە باسەکانی چەندین بیروباوەڕی جیاجیا لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و هەمووشیان شانازی بکەن و بە خۆیاندا هەڵبلێن. کە ئەمە دەڵێم ئاگاداری هێندێم بیروباوەڕی خۆیشم، کە هەبێ، یەکێکە لەو شانازیکەرانە و بەخۆدا هەڵگوتوانە و هەر لە هەمان ڕێبازی یەکجار فراوانی زمانزانیەوە یەکێکی وەک من دەرفەتی دەبێ لە کنارێکەوە هەنگاو هەڵێنێ و خۆ بترنجێنێتە ڕیز و کۆڕی بلیمەت و پسپۆڕ و ئوستادانی ئەم بەشە گرنگەی زانستی مرۆڤ.

لە ڕواڵەتدا زمانیش هەر بەقەدەر دیمەنە بەرچاو و ئاشکراکانی تری جیهان دەروونی دەکاتەوە بۆ سرنج و تێوەڕامان. خەیاڵێکی سەرپێی دەڵێ ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ وا لە چاوان دەچەقن لە هەڵاتن و ئاوابوون و خوار و ژوور کردنیاندا… گیا و گەڵای دەشتودەر لەبەر هەستی پەنجەکانماندا دەردێن و گەشە دەکەن و وشک دەبن… شاخ و گرد و تەلان و هەڵدێر و ئاو و ئاگر و ئاژەڵ کەرستەی گوزەرانی ڕۆژانەمانن… هیچ کامێکیان پەردەی نهێنی لە خۆی نەئاڵاندوە و بەقەدەر ئەلف بێی ئاخاوتنمان، لەوانیش زیاتر، دێنە بەر پێنج هەستەی ئادەمیزاد. کەواتە زانستی زمانیش یەکێکە لەو زانستانەی سەرچاوەکانیان ڕوونە و لە دیمەنی ئاشکراوە «انعکاس» دەکەنەوە بۆ بەر هەست و زیهنی مرۆڤ، هێندەی وانیش پێویستی هەیە، یا نیە، بە فێرکار و مامۆستا بۆ لێ شارەزابوونی.

ئەم خەیاڵە سەرپێیە فڕی بەسەر ڕاستییەوە نیە:

ئاخاوتن سەرەڕای ئەوە کە بەرهەمێکی هەست پێکراوی بێ پەردە و ئاشکرای مرۆڤە، زادەی ئیرادە و خواهیشت و هۆشی مرۆڤیشە، با بڵێم دەسکردی هۆشیەتیی... مەخلووقی زیهنیەتی. مرۆڤ نازانێ چۆن دەبینێ و دەچێژێ و دەبیسێ و دڵی لێدەدا و زراوی کار دەکا و مووی درێژ دەبێ و ددانی دەکەوێ... بەڵام دەزانێ چ دەڵێ و بۆچی دەڵێ... دیتن و چێشتن و بیستن و دڵ لێدان و ددان ڕوان و کەوتن دەسکردی مرۆڤ نین، کاری سروشتن لە مرۆڤدا و لە غەیری مرۆڤیشدا. بەڵام ئاخاوتن هەموو پیت و وشە و ئەمڕاز و ڕستە و تێکهەڵکێشان و دارشتن و کورت کردنەوە و درێژە پێدانێکی کوتومت خەڵقی خواهشت و ویستی مرۆڤە، زەنەی هەست و بیریەتیی. دارتاش کە تەختێک دەکا دار و بزمار و مشار و لۆکە و قوماشەکە لە لاوە دێنێ و دەیانکا بە تەخت. بەڵام هەمان دارتاش کە قسە دەکا سەرلەبەری ئاخاوتنەکەی لە دەروونی خۆیەوە دروست دەکا، لە نەبوونەوە دەیهێنێتە بوون. دەروونی دارتاش سەرچاوەی ئاخاوتنە زیاتر لەوەی کانی سەرچاوەی ئاو بێ چونکی ئاوی کانی مەخلوقی کانیەکە خۆی نیە، بەڵام ئاخاوتن مەخلوقی دەروونەکە خۆیەتی. تەنانەت بەرهەمی هونەرمەندیش، وەک ڕەسم و پەیکەرتراشی و مۆسیقا، بە قەدەر ئاخاوتن مەخلوقی هونەرمەندەکە نیە چونکە کەرتەی بەرهەم هێنانی هونەر لە ڕەنگ و فرچە و مەڕمەڕ و کەمان و عود زادە و مەخلوقی هونەرمەند نین. قیاسی بەرهەمی هونەری لە ئاخاوتن ناکرێ، چونکە ئەو بەرهەمانە لە تەک ئاخاوتندا زۆر بێگانە خۆ دەنوێنن بە نیسبەت مرۆڤەوە. قیاسیان لەگەڵ نووسین دەکرێ لەو ڕووەوە کە خامە و مەرەکەب و کاغەزیش وەک کەرستەی بەرهەمی هونەریی شتی لاوەکیی و دەرەکین بە نیسبەت دەروونی مرۆڤ کە کارگەی ئاخاوتنە.

ئەم نیسبەت و پەیوەندییە یەکجار نێزیکەی میانی مرۆڤ و زمان کە نیسبەتی خەڵق و داهێنان و هەڵقوڵین و زەنە کردنە، وا دەکا کە زمانزان لە

خەریکبوونی بە زانستی زمانەوە وەک خەریک بێ بە دەسکردێکی ئاشکرا و مفهومی خۆیەوە وایە، هێندەی کە خوێندنەوەی کتێب و نووسراو و تیۆریەکانی سەر بە زمان یاریدەی دەدەن بۆ قووڵبوونەوە لەم زانستەدا، زیاتریش لەو، ووردبوونەوە و سرنج گرتن و بەراورد کردن لە خودی زمانەکە، کە تەرجومانی دەروونی خۆیەتی، ڕۆشنایی بۆ هەڵدەکەن و تەرکیبی زمانەکەی بۆ ئاشکرا دەکەن وەک ئەوەی لەبەر یەک هەڵوەشا بێ و گرێوگاڵ و تەگەرەکانی کردبێتەوە و نهێنیەکانی ڕەواندبێتەوە.

ئەم تێبینییانە دوو ئەنجامی گرنگ بە دەستەوە دەدەن.

یەکەم: زمانزان ڕێی ئەوەی نیە دەم لە زمانێکی بێگانە بدا تا بە ڕادەی زمانی مادەرزادی خۆی لێی شارەزا دەبێ. فێربوونی «رسمی» و دەرس خوێندن لە زمانێکدا مرۆڤ ناکا بە شیرمژی ئەو زمانە. بۆ کوردێک کە عەرەبی یا ئینگلیزی فێر دەبێ ئەوەندە بەس نیە لە ڕێی فێربوونەوە بزانێ عەرەب و ئینگلیز کار «فعل» پێشی بەرکار «مفعول» دەخەن و دەڵێن و دەڵێن «أرى رجلا، I see a man» و وەک کورد ناڵێن «پیاوێک دەبینم» و بەرکارەکەش پێش بخەن... تا کوردێک مافی ئەوەی دەبێ دەم لە ڕێزمان و تایبەتیەکانی عەرەبی و ئینگلیزی بدا، پێویستە وەک ئینگلیزێک و عەرەبێک پێشخستنی بەرکاری لێ ببێتە سەلیقەی، لە بیری بچێتەوە کە لەو پێشخستنەدا دژی سەلیقەی کورد ڕەفتار دەکا. گەورەترین هەڵەیێکی شاگردی زمان بیکا ئەوەیە دەرس لای مامۆستایێک بخوێنێ کەوا هەر بایی ئەرکی سەرشانی زانایێکی ئەکادیمی شارەزای ئەو زمانە بێ کە بە دەرسی دەڵێتەوە. زمان هەر کار و کارا و بەرکار و تێپەڕ و داهاتو و وشە و ئەمراز... نیە، شیرازە و تەقەڵ و درومانێک کە ئەمانە بە یەکەوە دەبەستێتەوە، گیان و هەست و هۆش و سەلیقەی مرۆڤ خۆیەتی. بەرەو ژووری مێژوو بۆ زمانەکەت سەرکەویت، جوڵەی مێشک و خورپەی هەناو و سۆزی دڵ و تاسەی گیانی باپیرەکانی تێدا دەدۆزیەوە کە ئێستاکە خۆت بێ مامۆستا و

دوور له لاسایی، به سەلیقه دووبارەیان دەکەیتەوه بێ ئەوه توانیبێتت فکر بکەیەوه له سەرچاوەکانیان. زمانزانێکی بێگانه له فەرزی به دەرسیش ئەو مێژووه بخوێنێ، له تاکه ڕێی مێشکەوه فێری دەبێ و له تاکه ڕێی زمانەوه دەیداتەوه، مەگەر بۆی بلوێ وەک تۆ تێیدا بکوڵێ و فرچکی زانایانەی پێوه بگرێ. به داخەوه، دیومه مامۆستای زمانی کوردی له ڕێی فێرکاری «معلم» بێگانەوه چۆته ناو زمانەکەیەوه و ڕێزمانێکی تەرجەمه کراوی به دەرس وەرگرتوه و دەیەوێ بیکا به کلیل، ڕاستی و نهێنیەکانی زمانی کوردی پێ بکاتەوه. چەندین جار له وتوێژدا دووچاری دڵگەرمی بووم لەوەدا که دەبینم ڕۆشنبیرێکی کورد له موناقەشەی پرسیارێکی زمانی کوردی به ئاسایی و بێ پەروا بنێشتۆکەی «کوردی له زمانەکانی هیندی – ئەوروپاییه» ی جێواوەتەوه به جۆرێک هەر دەڵێی بیری نەکردۆتەوه لەوه که کۆیی و پژدەر و دیاربەکر و هەورامان و شکاک و قامیشلیش کوردن، نەک هەر «هیندی – ئەوروپایین» کەچی زۆر جار ئاخاوتنیان لەیەکدی دور دەکەوێتەوه.

دوەم: زمانزانانی زمانێک، که خۆشیان ڕزگار بکەن له تاو و تەئسیری زمانێکی بێگانه و به مێشکێکی ئازاد و کرایەوه دەست بکەن به تۆژینەوه له ڕێزمان و تایبەتیەکانی زمانەکەیان، لەوانەن به ڕێبازی جیاجیادا برۆن بۆ بنج و بناوانی باسەکانیان و ماوەی فراوان له یەکدی بترازێنن بێ ئەوەی یەکێکیان جارێ چووبێته ناو سنووری هەڵه. زمانەوان زانایێکی کیمیا نیه، که هەڵەی نەکردبێ، هەر بگا به تاکه ئەنجامێکی ڕاست له تەحلیلی ئاو و با و خاک. زمان له دەروونی خەڵقەوه هەڵقوڵیەوه بەسەر شەقامێکی هەزاران ساڵەی میژوودا، لەوانەیه گەلێک له دەستوورەکانی تێکەڵبوون و بەیەک گەیشتنەوەی چەند لەهجەیێک پەیدای کردبێ، یاخود له ئەنجامی دابەشبوونی شەقامه ڕێیێکی زمان بۆ چەند ڕێچکۆلەیێک ئەو دەستوورانه بەرهەم هاتبن، بەو پێیه دەشێ «اجتهاد» ی زمانزانێک بیگەینێ به ڕێچکۆڵەیێک که دراوسێی ئەو ڕێچکۆڵەیه بێ زمانزانێکی تر پێی گەییوه. به نموونه دەڵێم جارێکیان له وتوێژی میانی ئەندامانی لیژنەی ڕێنووس

دەربارەی هەندێ لە گیروگرفتەکان، من گوتم ئەو پیتە «د» ەی کە لە هەندێ لەهجەی کوردیدا دێتە میانی پیتی «ڕ» ی ئەسڵی وشە و «ر» ی سیغەی «بنا مجهول» ەوە بۆ مەبەستی سوک کردنی «تلفظ» ی هەردوو «ر» ەکەیە، وەک دەگوترێ «کرِدرا، گۆڕدرا». گوتم ئەو «د» ە وەک «نون الوقایە» ی زمانی عەرەبی وایە بە زیادەوە دێ بۆ مەبەستێکی تایبەتی.
یەکێک لە ئەنداماﻥ بۆ ئەو باوەڕە چوو کە ئەم «د» ە هەمان پیتی ڕەسەنی «کڕیدن و گۆڕیدن» ە لەم حاڵەی بەیەک گەیشتنەوەی دوو «ر» دەگەڕێتەوە بۆ ناو ئاخاوتن، کەواتە بە زیادەوە نەهاتووە وەک «نون الوقایە». ڕاستی هەر کامیان بێ، یا شتێکی تر بێ غەیری ئەم دوو ئیحتیمالە، زمانەوان و زمانزان لێی بە عەیب ناگیرێ، بۆ تەعلیلی زاهرەیێکی زمانەکەی، یەکێک لەو ڕێبازانەی پەسەند کردبێ کە دەست دەدەن بۆ «تعلیل» و لە ڕاستە شەقامەکانی زمانیشیان لا نەداوە، بە تایبەتی بە نیسبەت زمانی کوردییەوە کە تۆژینەوە و پشکنینەوە و تەقەللای دۆزینەوەی دەستوورەکانی، جارێ، کاری سەرەتایین و نەگەییون بە پلەی سەپاندن.

چاوەڕوان دەکرێ لە حاڵی ئێستاکەماندا زمانزانی کوردی، کە خۆی کورد بێ، یا لە ڕێی لاسایی کردنەوەی بێگانە، کە بە کارێکی نارەوای دەزانم، یا بەهۆی سرنج گرتن و «استقرار» ی خۆیەوە ڕێی ئەوتۆ بگرێتە بەر بۆ دانانی ڕێزمان «ڕاستییەکەی دەبێ بڵێین دۆزینەوەی ڕێزمان» زۆر و کەم جیاواز بێ لە ڕێی زمانزانێکی تر و بگا بە ئەنجامی سەربەخۆی خۆی لە بیرکردنەوە و پێوانە و کێشانەی زمانەوانی. بەلای منەوە هەر هەوڵێکی تایبەتی نهێنیەکی زمانەکەمان ئاشکرا بکا و دەستوورێکی ڕوون کاتەوە هەوڵێکی پیرۆز و بایەخدارە، ئەو ڕێگایە چ دەبێ با ببێ کە تەقەللاکە بەسەریدا گوزەری کردوە. گریمان تێکڕای شێوازی کارکردنێک لەسەر ڕێبازی زانستی تازەش نەڕۆیی بێ، دۆزینەوەی دەستووری ڕاست لە بەکارهێنانی ئەو شێوازە ناتەواوە نرخی کەم نابێتەوە. هەڵەی پەیڕەوی کردنی شێوازی ڕاستیش هەر بە هەڵە لە قەڵەم دەدرێ، و دروستی شێواز شەفاعەتی بۆ ناکا.

ئەم جۆرە بیر کردنەوە بۆ هەندێمان دەبا کە سەیرمان نەیێتەوە لە زۆربوونی بیروباوەڕی جیا جیا هەم لای زمانزانانی جیهان دەربارەی تێکرای زانستی زمان و سەرجوملەی زمانەکانی گەلان هەم لای زمانزانی تاکە زمانێک لە عاست سروشت و ڕێزمان و تایبەتیەکانی ئەو تاکە زمانەدا. بەولای سەیر پێ نەهاتن، بۆ ئەوەمان دەبا کە لەو حاڵە نارازیش نەبین و ئەگەر بە زیهنێکی فراوان سەیری دیمەنەکە بکەین خۆش ئامەدیش بکەین لە زۆری شێواز و جۆری تێفکرین لە زانستی زماندا، چونکە بێگومان هەر زانایە لە ئەنجامی هەست و تەسەورێکی سەربەخۆی خۆیەوە شێوازێکی سەربەخۆی گرتۆتەبەر، دەشێ بەرهەمێکی ئەوتۆ بە دەستەوە بدا لەو شێوازەوە نەبێ دەست نەکەوێ. ئەگەر لە نێو سێ چوار هەڵە ڕاستییێکمان پێ ببەخشێ زۆرمان قازانج کردوە.

چ لە تێکڕایی زانستی زمان بێ، چ لە تاکە سەرەباسی «بەشەکانی ئاخاوتن» بێ بیروباوەڕ و لێکدانەوەی زمانزان پەرواوێزی خۆی فروان کردوە و ژمارەی بەشەکانیش تێهەڵکشاوە. وا پێ دەچێ هەر لە فرەوانبوون و تێهەڵکشانیش بێ تا ماوەییێکی نادیاری دوا ڕۆژ.

بە نیسبەت «بەشەکانی ئاخاوتنەوە» ەوە ئەو دابەش کردنانەی لەلایەن زمانزانی کوردەوە بە زۆری لە کار هاتوون، سێ بەشەکەی عەرەبی «اسم، فعل و حرف جر» و هەشت بەشەکەی ئینگلیزی «ناو، ڕاناو، ئاوەڵناو، کار، ئاوەڵکار و preposition ، ئەمرازی پەیوەندی و Interjection » ن.

ئەو کوردانەی لە بابەت ڕێزمانی کوردییەوە نووسیبێتیان، بە پێی سەرچاوەی سەقافەتیان پەیڕەوی عەرەبی یا ئینگلیزییان «چاکتر ئەوەیە بڵێین ئەوروپایی» یان کردوە. نووسەری کورد هەیە هەر ئەو سێ بەشەی عەرەبی کردوە بە بنجی نووسینەکەی و بەوەدا «ڕاناو — ضمیر» ی کردوە بە بەشێکی «ناو — اسم»، ئەو دەورەیشی داوە بە «ڕاناو — ضمیر» لە پێکهێنانی واتا و داڕشتنی ڕستە لە کوردیدا کە زمانزانی عەرەب بۆیان داناوە.

تاقمێکی تر لە زمانزانانی کورد کە پەیڕەوی ڕۆژئاوایان کردوە «ضمیر — ڕاناو» یان داناوە بە یەکێک لە بەشەکانی ئاخاوتن، بەڵام هەروەک لە زاراوەکەی «ڕاناو — Pronoun » ڕا دەردەکەوێ ئەو کوردانەش وەک زمانزانانی ئەوروپا «ڕاناو» یان بە سێبەرێکی «ناو» زانیوە و بە جۆرێک لە سەربەخۆیەتییان کەم کردۆتەوە کەڵکی ئەوەیان پێوە نەهێشتوە ئەو دەورە زلەی هەبێ کە لە ئاخاوتنی کوردیدا بە ڕاستی هەیەتی. وردە وردە لەگەڵ ڕچەی نووسینەکەم ئەم ڕاستییەت بۆ ڕوون دەکەمەوە، وەک خۆم لە «ڕاناو» و دەوری یەکجار گەورەی لە ئاخاوتنی کوردیدا تێگەیشتووم.

پەیڕەوانی زمانی عەرەبی لە کوردیشدا هەر بە «ضمیر» ناوی ئەم بەشەی ئاخاوتنیان بردوە، ئەو چەند وشەشیان بۆ «ضمیر» داناوە کە لە عەرەبیدا «ضمیر» ن.

شاگردانی فێرگەکانی ئەوروپاش، وەک ئەوروپاییەکان ڕاستەوخۆ «Pronoun» یان وەرگێراوەتە سەر کوردی، هەندێکیان پێی دەڵێن «بۆناو» هەندێکیان «جێناو» هەندێکیشیان «ڕاناو» یان بۆ کردوە بە زاراوە. ئەم وشەی دوایی لە نێو کوردستانی خوارودا باوی ستاندوە و زوربەی نووسەران بۆ «ضمیر، Pronoun» بە کاری دێنن، منیش کوردی گوتەنی «بە گوێی مامۆستا» کردومە بە سەرەباسی ئەم گوتارە. هەر لەم ڕێبازەی چاولێکەری زاناکانی ئەوروپاوە نووسەرەکانمان هەموو ئەو وشانەیان بە «ڕاناو» لە قەڵەم داوە کە لە زمانەکانی ئەوروپادا پێیان دەڵێن «ڕاناو» و بەر ئەو «تعریف» ە دەکەون کە بۆ ڕاناویان هەڵبەستوە.

تۆ بڵێی «ڕاناو، ضمیر، Pronoun » لە کوردیدا هەر ئەوە بێ کە عەرەبی بۆ خۆی بە «ضمیر» ی داناوە؟ یاخود ڕاستە «Pronoun» کە پێی بڵێین «ڕاناو» ئەوەندە فراوان و بێسنوور بێ کە ئەوروپاییەکان جغزیان بۆ پان کردۆتەوە؟ ئایا سروشتی زمانی کوردی و سەلیقەی قسەکەری کورد

دەیسەلمێنێ بەو وشانەی پێیان دەگوترێ «ڕاناوی لکاو» لە کوردیدا ئەو واتایە ڕاگەیەندرێ کە «is, am, are» لە ئینگلیزیدا ڕایدەگەیەنن؟

چت لێ بشێرمەوە، ڕۆشنبیری کورد، بەدبەختانە نەمتوانیوە لەگەڵ یەکێک لە خاوەن بیروڕایانی کورد بگونجێم لە سەرپاکی باسی «ڕاناو، ضمیر، Pronuon» بگرە هەر لە سەرەتاوە ڕازی نیم بە زاراوەی «ڕاناو، بۆناو، جێناو، بەرناو» کە جۆرێکن لە وەرگێڕانی وشەی «Pronoun» بۆ سەر زمانی کوردی. خۆ دابڕینی زاراوەی «ضمیر» بەسەر ئەم بەشەی ئاخاوتن، کە تەسەوری زانایێکی عەرەب دەداتەوە بۆ ناو ڕێزمانی کوردی نە زمانەکەمان لێمان دەسەلمێنێ و نە هیچ لایەنێکی باسەکە ڕوون دەکاتەوە. کە ڕێمان ببێ «ضمیر» بەکار بێنین، بۆ نەڵێین «بارز، واضح، معلن» چونکە ئەو واتایەی «اضمار» کە عەرەب هەستی پێ دەکا لە سروشت و دەوری «ضمیر» ی عەرەبی، دەبێ کوردێک دژی ئەو هەست پێ بکا کە سرنج بگرێ لە «ضمیر، ڕاناو» لە ئاخاوتنی کوردیدا لەو ڕووەوە کە ڕستەی واتاداری خاوەن «اسناد، حکم» لە کوردیدا دروست نابێ بێ «ضمیر، ڕاناو». بەشێکی یەکجار کەم نەبێ لە ڕستەی کاردار «جملة فعلية» لە کوردیدا، هەرچی ئاخاوتن هەیە بێ «ڕاناوی لکاو» نابێتە ڕستەی تەواو.

کە خۆمان ئازاد کەین لە لاسایی کردنەوە و ڕەها بین لە تاوی بیروباوەڕی حازر و بزری زمانزانە ناودارەکان و سرنج بگرین لە سروشتی زمانەکەمان وەک هەیە، نەک وەک لە ئاوێنەی ڕێزمانی بێگانەدا دەیبینین، بایی لێوەشانەوەی باسەکەش بەشە جوداکانی ئاخاوتن هەڵسەنگێنین و بەیەکدییان بگرین، بۆ زیهنی ڕوون و کرایەوەمان دەردەکەوێ ئەو تاقمە وشەی کە لە زمانەکەماندا دەبنە «ڕاناوی لکاو» بەشێکی هێندە بنجی و سەربەخۆن لە ئاخاوتندا و دەورێکی وەها بێ هاوتا پێهەڵدەستن لە داڕشتنی ڕستەی تەواودا کە هەرگیز نەشێ بە بیرماندا بێ ئەو وشانە بکرێن بە سێبەری هیچ یەکێک لە بەشەکان، چەندی گرنگ دەبێ و ئەو بەشە با ببێ.

بۆ دەرخستنی دەوری لە غایەت بەدەر گرنگی ئەو تاقمە وشەیە لەوە تێفکرە کەوا ئیمکان هەیە ڕستەی تەواو پێک بێ لە کوردیدا بێ لە بەکارهێنانی ناو، یاخود کار یا ئاوەڵکار، یا هەر بەشێکی تر بێ لە بەشەکانی ئاخاوتن، بەڵام ڕستەی تەواوی «اسناد دار» بێ «ڕاناوی لکاو» پێک نایێ. ئەم کۆمەڵە نیمچە وشەیەی کە پێیان دەگوترێ «ڕاناوی لکاو» لە دروست کردنی ڕستەدا وەک داوە دەزوو وایە کە پارچەکانی قوماشێک بە یەکدیدا دەدروێ و دەیانکا بە جلوبەرگ، یا ئەو لەحیمەی وردە ئەمرازی مەعدەن بە یەکدییەوە دەبەستێتەوە و مەکینەی تەواویان لێ پێک دێنێ.

بۆ خۆت لەگەڵ خۆتدا خەریکی گوتنەوەی گوتەی جۆر جۆری زمانەکەت بە و سرنج لە کەرت و بەشەکانی بگرە و بیانخە بەر تەرازوی «منطق» و هەست و زانینت... وا منیش فکری خۆم لەگەڵ هی تۆ جووت دەکەم و ڕستەی جودا جودا لێرە و لەوێ، بێ ئامانج و مەبەستی دیارکراو، بەسەر زماندا دێنم... «وەی چ خۆشە سەرکەویت... تا توانیم ڕۆیشتم... بڕۆن بۆ خۆتان بخولێنەوە... تا دەست نەدا خەنجەری نەیفەرموو دەسا دەی... چیە گوارە گوناهی وا بە نەستەق - بە گوێ هەڵتواسیوە سەر معلق... بەردەکان زلن... ئێمە کوردین... دوای حەسانەوە ڕۆیشتین...». تا ڕستەی واتاداری تەواو بێنینەوە ڕاناوی لکاو، بە ناچاریی و بە دائیمی، یەکێکە لە کەرتە بنجییەکانیان. ڕەنگە «کار» لە ڕستە دەرنەکەوێ و واتاش تەواو بێ. وەک کار «ناو» و هەموو کەرتەکانی تری ئاخاوتنیش هەر وان، تەنانەت نەلکاویش هەموو جاران لە قسەدا دەرناکەوێ، تاکە کەرتێکی بێ بڕانەوە هەر ڕاناوی لکاوە.

دەوجا کە بەشێکی ئاخاوتن ئەوە بێ ڕستەی واتاداری تەواو بێ ئەو پێک نەیێ، چۆن ڕەوایە تێکەڵ بەشتی تر بکرێ کە دەگونجێ هەبێ و نەبێ لە ڕستەدا؟ ئەم جیاوازییە زلەی میانی ڕاناو و غەیری ڕاناو کە نەبێتە هۆی جیاواز کردنەوە و هەڵاوێردنی، ئیتر لزوم چیە بەشەکانی تری ئاخاوتن لە یەکدی جیاواز بکرێنەوە و خۆمان بە لێتۆژینەوەیان ماندو بکەین؟ تا خەریک

بین جیاوازی بدۆزینەوە لە میانی ئاوەڵناو و ئاوەڵکار «صفه و ظرف» ناگەین بە دەیێکی ئەو جیاوازییەی وا لە میانی ڕاناوی لکاوی «هەڵستاین» و وشەی دارا و باغ و مامزدا هەیە.

پەیڕەوانی فێرگەکانی ئەوروپا ڕاناوی زمانی کوردی دەکەنەوە بەو هێندە بەشەی کە لەو زمانانەدا بە ڕاناو حیساب کراون. سەرجوملەی دابەش کردنەکەیان ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

1- ڕاناوی کەسی Personal pronoun وەک: من، ئێمە، تۆ، ئەو، ئەوان لەگەڵ جۆری لکاویان کە جیاوازی تێدایە هەم لە کاری تێپەڕ و تێنەپەڕدا و هەم لە لەهجەیێکەوە بۆ لەهجەیێکی تری کوردی.

2- ڕاناوی لێکدەر، ربط، گەیەنەر، پێگەهـ پەیوەندی، لە ئینگلیزی Relative Pronoun، لە دەستووریکی فارسی «حرف ربط» ی پێ گوتراوە و ناوی تریشی هەیە غەیری ئەمانە. وێنەی ئەم ڕاناوە لەم ڕستەیەدا دیار دەکەوێ «ئەوەی کە دوێنێ هاتە لام بارام بوو». بەلای هەندێ زمانزانەوە هەر «کە» یەکە ڕاناوە، بەلای هەندێکیشەوە ئەو پیتەی «ی» ی دوای یەکەم وشەی ڕستەکە ئەویش هەر ڕاناوە.

3- ڕاناوی پرسیاریی، وەک: کەی، کام، کوێ، چۆن، کوا، بۆ، چەند، ئاخۆ، ئایا، کامەتە، کامەیە...

4- ڕاناوی ئیشاری وەک: ئەمە، ئەوە، ئەمانە، ئەوانە، هۆوانە، هۆ و هێ...

5- ڕاناوی خۆیی وەک: خۆم، خۆت، خۆی، خۆمان...

6- ڕاناوی هەیی وەک: هی من، هی تۆ، هی خۆما، یاخود هین من ، هین تۆ، بە پێی لە کارهێنانی ناوچەیی لە هەندێ شوێنی کوردستانی ژێرەوەدا...

7- ڕاناوی نادیار هەندێک پێی دەڵێن بۆناوی «مبهم» – ناوی تریشی هەیە- کە بگەڕێین بە دوا هەموو جۆرە ناوەکانی.

ئەم ڕاناوە «نادیار – مبهم» ەیان دابەش کردوە بۆ دوو بەش:

أ- ڕاناوی نادیاری سادە - یاخود ڕووت وەک کەس، کام، پیاو، چی، هیچ، کابرا، فڵان، هین، هەموو، کەم، یەک، هەرامە، وانێک...

ب- ڕاناوی نادیاری لێکدراو وەک: هیچ کەس، هینەکە، کابراکە، هەر کابرایێ، هەموو کەس، یەکێ تر، گەلێ، کەسێ، نەختێ، فڵانەکەس...

ئەم کۆمەڵە وشەیەی لەیەک نەچووی، واتا جیاوازی، خاوەن تایبەتی سەربەخۆ لە ڕستەدا خراونەتە ژێر ناو و عینوانی ڕاناو لەبەر هۆیێکی بنجی: گۆیا هەر یەکێک لەمانە بگرە لە وشەی «من» تا دەگاتە «فڵانەکەس» جێگەی ناوێکیان گرتۆتەوە لە ڕستەدا و دەشێ وشەکە لابەیت و ناوێک بخەیتە جێگاکەی، واتە کە گوتت «کابرا هات» دەتوانی بڵێی «دارا هات»، هەروەهاش ئەو وشانەی تر کە لە لیستەی سەرەوەدا بەدوا یەکتردا قەتارمان کردن هەموویان ئەو قابیلیەتەیان تێدایە کە ناو بخرێتە جێگایانەوە.

بێگومان لە قەواڵەی گوتارێکدا مەودای موناقەشە و نرخاندنی هەریەک لەو بەشانە و لەو وشانە پەیدا نابێ، کە بمەوێ لەسەر هەموویان بدوێم دەبێ نیمچە کتێبێکی لەسەر بنووسم، کەواتە بیروباوەڕ و ڕەخنەییێکم کە هەبێ دەربارەی سەرپاکی باسەکە دەبێ بە جۆرێکی گشتی و لە گۆشەی نیگای تەسەوری خۆمەوە بەرەو پیرەیان بچم، نەک مفرەداتی لیستەکان خورد کەمەوە و هەریەکەیان باوێمە ئەو پەراوێزە ڕێزمانیەوە کە بە پێی قەناعەتی خۆم پێی رەوا دەبینم. بە نموونە دەڵێم دەربارەی ئەو کەرتەی پێی گوترا «ڕاناوی پرسیاریی» سەرەرای ئەوە کە من بە ڕاناوی نازانم، مفرداتی کەرتەکەش بە چەند جۆرێک دادەنێم. وشەی «کێ» پرسیارە لەبارەی

«کەس» ەوە. وشەی «ئایا» پرسینی «مطلقە» و ناچێتە ڕیزی «کێ و چەند و کوێ» ەوە. «ئایا» ئەمڕازی پرسینە و «کێ» ناوێکی ڕێکوپێکی سەربەخۆی واتاداری پرسینە. تەعریفێک کە دانراوە بۆ «ناو» وشەی «کێ» ی بەردەکەوێ بەڵام وەک لاستیکیش لێکی بکێشیتەوە باوەش بە وشەی «ئایا» دا ناگرێ مەگەر بە زۆرە ملێ و کوتەکم حقی چن... ئەوەی ڕاستی بێ وشەی «ئایا، ئاخۆ، ئەرێ» هەر لە ڕێی ئەوەوە کە واتای پرسیاریان تێدایە دەترنجێنە ناو پەراوێزی «ڕاناو» ەوە، دەنا ئەگەر بەهۆی بەشداربوونیان لە واتای پرسیار نەبێ کە کۆیان دەکاتەوە لەگەڵ «ڕاناوی پرسیاریی» هەرچی پەیوەندی و خزمایەتی و نزیکی هەیە لە میانی ئەمان و ڕاناودا پەیدا نابێ، چونکە بە هیچ زانا و پسپۆڕ و پاڵەوانیش ناکرێ پێمان بسەلمێنێ ئیمکان هەیە ناوێک بخرێتە شوێنی «ئایا» لە ڕستەدا تا هەر نەبێ لە ڕواڵەتدا پێی بگوترێ «ڕاناو، جێناو، بۆناو، Pronoun». ئەگەر بە تەئویلێکی زۆر دوورەدەست زمانزانێک هەڵمانفریوێنێ بەوە کە «ئایا» دەست دەدا ناوێکی بخرێتە جێ، من لە ئێستاوە پێشنیاز دەکەم «هەلاو» یش بە ڕاناو قبوڵ بکرێ چونکە دەشێ بڵێین مەبەستمان لە وشەی هەلاو «مرۆڤی ئەوپەڕی تەلەکە» یە.

دەمەتەقە و موناقەشە لەسەر ئەو بیروباوەڕەی «ڕاناو» ی کردە 7 جۆر و «م» ی وشەی «گرتم» ی لەگەڵ «فڵانەکەس» لە ژێر یەک عینواندا کۆکردەوە و بە هەردوویانی گوت «ڕاناو» نە سەری دیارە نە بن، ئەوەندەی بە دوای کەوین و لێی بکۆڵینەوە و ڕەخنەی لێ بگرین بە بەریەوە هەیە. کە بمانەوێ دەتوانین بۆ ماوەیێکی دور و درێژ هەر بەردەوام بین لەسەر بەراوردکردنی «کە» ی ڕستەی «ئەو پیاوەی کە هات» لەگەڵ وشەی «خۆمان» یاخود وشەی «کابرا» یاخود «هین» و چەندین جار خۆمان و خەڵقیش ئیقناع کەین کە ئەمانە ناشێن هەموویان بخرێنە ژێر عینوانێکەوە و لەوەشرا هەنگاوی تر هەڵێنین بۆ دەرخستنی نادرروستی ئەو بیروڕایانە بەهۆی هێنانەوەی ڕستەی وەک «ئایا کە ئێوە هیچ خۆتان بۆ من نەبزێون

بۆچی من هی ئێوە بم» کە بە پێی دابەش کردنەکەی سەرەوە لە 15 کەرت 12 کەرتی ڕاناوە!! خولاسە مەیدانی ڕەخنە بەر فراوانە و بە پێی باوەڕی من ڕەخنەکانیش زۆر بەهێزترن لەو بنگە فکرییانە کە زمانزانەکان بەڵگە و ئیسپاتیان لێ هەڵقولاندوە بۆ کۆکردنەوەی فەرهەنگۆکێکی وشەی لەیەکدی جودا لە ژێر عینوانی «ڕاناو» دا.

من کە عوزری بێ مەودایی دێنمەوە لە پەراوێزی گوتار، ئەسەفێکی کەم ناخۆم بۆ ئەو بێ مەوداییە لەو ڕووەوە کە هەڵسوڕ و داسووڕی فکر بە دەوری ئەو وشانەدا بە دەم سرنج دانێکی ورد و قووڵ لە سروشت و کونهی واتایان و دەوریان لە ئاخاوتندا، بێگومان، گەشتێکی خۆش و سوودبەخشمان پێ دەکا لە ڕووپێوێکی پان و بەرینی زمانەکەمان. لە ڕەتی پشکنین و تۆژینەوە لە زماندا بە کوتانەوەی «بدیهیە» کانی نایەتە بەر چەژی پشکنەر و خوێنەر، خەریکبوون بە وردەکاریی شیکردنەوە و هەڵوەشاندنی ڕایەڵ و تەقەڵەکانی ناوەڕۆکی زمان و بەدوادا گەڕانی پەیوەندییەکانی ناوەکی «داخلی» مەیلە و نهێنی میانی وشە و ڕستە و داڕشتن و واتای ئاخاوتن، زاخاوی مێشک دەدەن و نیگا فراوان دەکەن. کە لەم گوتارەدا ئەمەم بۆ نەکرێ هەلێکی زلم دۆڕاندوە و خۆشیێکی زیهنی شیرینکەلەم لە کیس چووە. تۆ بڵێ چەندمان زیاد دەکرد لە خەرمانی زمانزانییمان ئەگەر لە موناقەشەی وشەی «هیچ» گەیشتباین بە دۆزینەوەی ئەو تایبەتییەی وای کردوە کە دەڵێی «فڵانە شت هیچە، فڵانە شت هیچ نیە» هەمان واتا بە دەستەوە بدەی و «سلب و ایجاب» وشەکە لە موتڵەقی «سلبیة» نەگۆڕێ؟ وەک وشەی «هیچ» گەلێکی تریش لەوانەی بە ڕاناو دانراون سەرگوزەشتی سەربەخۆیان هەیە و هەریەکەیان لەلای خۆیەوە تیشکێک داوێژێ بۆ یەکێک لە دەربوونەکانی زمان. کە ئەم وردبوونەوەیەم بۆ نەکرێ ناچارم قسە لە تێکڕای ئەو «ڕاناوانە» بکەم و ڕەخنەی گشتیی لەو بنگە فکریە بگرم کە لە سەری هەڵچەقیون لەگەڵ دەربڕینی تێبینی و سرنجی تایبەتیی خۆم، کە هەبێ، دەربارەی سەرجوملەی باسەکە.

وەک لێرە بە پێشەوە گوتم ئەو کۆڵەکە ناوەندییەی باوەڕی خاوەنی فێرگەی «حەوت جۆر ڕاناو» ی پێوە وەستاوە دەست دانی وشەکانە بۆ هاتنی «ناو» لە جێی ئەوان.

ڕەخنەیێکی بنجی سەرەتایی لەو تێفکرینە ئەوەیە کەوا گوێ ناداتە ئەو ڕاستییە کە جۆر و چۆنەتی و سروشتی وشە لە پێشەوە و بەر لە هاتنی بۆ ناو ڕستە لە خودی وشەکە و واتای سەرهەڵدەدا و دەسەپێ، هەر ئەوساش دەبێ ناو و عینوانی بۆ داندرێ، لەوە بەولاوە کە بە پێی قابلیەتی واتاکەی دەستیدا بچێتە قاڵبی جیاجیاوە ناشێ بگوترێ سروشتێکی نوێی لێ ڕسکا لە گوێرەی پێداویستی ئەو قاڵبە تازەیە، بە نموونە دەڵێم کە وشەی «کەس» بە خۆی و واتایەوە بەر «تعریف» و سروشتی «ناو» کەوت ئیتر یەکجارەکی دەبێ بە «ناو» لە قەڵەم بدرێ، لەوە بەولاوە چوونی بۆ ناو قاڵبی جیا جیا حاڵەتی وشەکە دەگۆڕێ نەک واتا و جۆری. هەندێک، یاخود بەشی زۆر، لە زمانزانە تازەکانی کورد پەیڕەوی ئەوروپاییەکان دەکەن و دەسەلمێنن یەک وشە لە ڕستەیێکدا ئاوەڵناو «صفة» بێ و لە ڕستەیێکی تردا ئاوەڵکار «ظرف» بێ، یاخود ڕاناو ببێتە ئاوەڵناو... هەرچەند من لێرەدا قسەم لەگەڵ «ڕاناو» ە بەڵام زیانێک نیە لەوەدا بڵێم زمانی کوردی ئاوەڵناو و ئاوەڵکار «صفة وظرف» ی لەیەکدی جودا کردۆتەوە بەر لەوە بچنە ناو ڕستە. ئاوەڵناو «صفة» زۆر بەرچاوە پێویست نیە من لیستەی بۆ بگرمەوە، بەڵام ڕەنگە لزوم هەبێ بڵێم بۆ ئاوەڵکار «ظرف» دو سیغەی قەراردادە هەیە جگە لەوە کە وا دەبێ ڕستە و نیمچە ڕستەش دەوری «ظرف» ببینن. دەگوترێ «کورد مەردانە خەبات دەکا» وشەی «مەردانە» ئاوەڵکارێکی بێ فێلە و هەر لەگەڵ «کار — فعل» دا بەکار دێ و هەرگیز ناگوترێ دارا مەردانەیە یاخود زیرەکانەیە. دەشگوترێ «حەز دەکەم بە خۆشیی لەگەڵت ڕابوێرم». ئەم وشەی «بەخۆشیی» ئەویش ئاوەڵکارە و هەر وەسفی «کار — فعل» دەکا و نابێتە ئاوەڵناو، تۆ ناتوانی بڵێی «دارا بە خۆشییە، من بەپیاوەتیم». ئێمە ئەگەر لاسایی زمانی بێگانە بۆ هەڵەمان نەبا دەزانین کورد وشەکانی وەک «چاک،

خۆش، سارد، گەرم، جوان، دزێو، بەرز، نزم، تاڵ، شیرن... هتاد» ی لە بنەڕەتا بە «ئاوەڵناو – صفه» دروست کردوە و کە هیچ پێچەکە و خوارەکە و تەئویل لە ئاخاوتندا نەبێ ئەمانە ڕاستەوخۆ وەسفی ناو دەکەن، واتە لە گوتنەوەی ئەو وشانە خەیاڵی کوردێک تەنها بۆ وەسف کراوێکی خاوەن کیان دەڕوا چ مادی بێ چ مەعنەوی و هەرگیز بە بیریدا نایێتەوە کەسێک بڵێ «ڕۆیشتم تاڵ، دەڵێم شیرن...». ئەمە ڕاستییێکە، بەلای منەوە، نەسەلماندن هەڵناگرێ. دەوجا کە بە پێی سەلیقەی کوردانەمان بڕیارمان دا «جوان، تێر، خراپ» بە ئەسڵ «ئاوەڵناو – صفه» ن لەوە بەولاوە کە کەوتنە قاڵبی ئەوتۆ لە ڕواڵەتدا وەسفی غەیری ناویش بکەن نابێ زوو تەسلیم بین و بڵێین ئەم وشانە سروشت و واتایان دۆڕاند و بوون بە شتێکی جودا لە «صفه». بەلای منەوە کە گوترا «فلانەکەس زۆر دەخوا» لێرەدا هەرچەند لەبەرچاوان وشەی «زۆر» وەسفی ناویش ناکا لە ڕاستیدا هەر «ئاوەڵناو» ە. دەتوانین بەوە دڵنیا بین کە «موصوف» ێکی قرتاو هەبووە و تێچوە، وەک ئەوەی کە ئەسڵی ڕستەکە «فلانەکەس خواردنێکی زۆر دەخوا» بووبێ. تۆ سەیرکە وشەی «زۆر» لە ڕستەکەدا جێی «بەرکار – مفعول» ی حەزف کراوی گرتۆتەوە و لە پێش «کار – فعل» ەوە هاتووە وەک «بەرکار، مفعول» ی صەریح، گریمان ئەو سازاندنە «تعلیل» ئیقناعیشمان نەکا و نەسەلمێنین بەرکاری[8] حەزف کراو هەبووبێ، چ چار نامێنێ دەبێ بڵێین زمانی کوردی ئەوە هەڵدەگرێ ئاوەڵناوەکانی، کە لە بنەڕەتا بە ئاوەڵناوی پەیدابوون، وەسفی کاریش بکەن و نەبنە ئاوەڵکار، واتە بکەونە حاڵەتی وەها لە ڕستەدا کە ڕواڵەتی ئاوەڵکار بنوێنن، چونکە ئاوەڵناوبوونی ئەم وشانە دەمەتەقە هەڵناگرێ. سرنج بگریە ئەم میسالەی خوارەوە نەختێکی تریش ڕاستییەکەت بۆ ئاشکرا دەبێ، دەڵێی «دارا بە منداڵی ژیر بوو». دەزانین وشەی «بە منداڵی» ئاوەڵکارە و دارشتنەکەشی هەر هی ئاوەڵکارە. ئەدی وشەی «ژیر» چیە؟ خۆ لە ڕستەکەدا نەکەوتۆتە جێگەی ڕێزمانی ئاوەڵناوەوە هەرچەند وشەی ژیر بۆ خۆی ئاوەڵناوە، چونکە دەزانین وشەی «صفه» لە کوردیدا دەکەوێتە دوای

وشەی «موصوف» ەوە وەک بڵێی «منداڵی ژیر، مەلی جوان»؟ کەواتە لێرەدا وشەی «ژیر» کە «ئاوەڵناو» ێکی ڕاستەقینەیە بە پێی پێویستی دەربڕینی مەبەس کەوتۆتە قاڵب، یاخود حاڵەتێک مەودای نادا خۆ لە ناوێک بئاڵێنێ و وەسفی بکا هەرچەند زمانی کوردی ئەو و ئاوەڵەکانی بۆ وەسفی «ناو» خەڵق کردوە.

بەلای منەوە هەروەک ناشێ وشەی «هات» جارێکیان فیعل بێ و جارێکیان «حرف جر یاخود ناو یاخود ئاوەڵناو» بێ هەروەهاش کە وشەی «چەند» مان بە «ناوی پرسیار» دانا ناکرێ لە دێرێکدا ناوی پرسیار بێ و لە دێرێکی تردا ئاوەڵناو یاخود ڕاناو بێ. نووسەری کورد هەیە لەو باوەڕەدایە کە گوتت «چەندت ژمارد؟» لێرەدا وشەی «چەند» دەبێتە «ڕاناو، ضمیر» چونکە ئیمکان هەیە جێی ژمارەیێکی گرتبێتەوە وەک لە وەرامدا بڵێی «بیستم ژمارد». بەڵام کە گوتت «چەند کەست ژمارد»؟ وشەی «چەند» دەبێتە «صفە، ئاوەڵناو» چونکە وەصفێکی وشەی «کەس» دەکا.

سەلماندنی ئەم باوەڕە، کوردی گوتەنی، دەرگەی خێران لە ڕاناو دەکاتەوە و دەیخاتە سەرپشت و بەشێکی زۆری وشەی فەرهەنگی کوردی دەکا بە ڕاناو. کە گوتت «باوکم هات» دەبێ لێرەدا وشەی باوکیش ڕاناو بێ چونکە دەتوانی بیگۆڕی بە ناوی باوکت و بڵێی «برایم بەگ هات» کە ناوی باوکت برایم بەگ بێ. هەروەها هەموو وشە ناوەکانی کەس و خزم و برادەر و جیران و دۆست و دوشمنت دەبنە ڕاناو چونکە «ئامۆزا، دایک، خوشک، برا... تا دەگاتە خزمی خەزووری سەپانی شێخی» هەموویان ئەحمەدێک، حەسەنێک، فاتیلەیێک هەن بچنە جێی ئەو وشانەوە. ئەوەی ڕاستی بێ کە ئێمە بیسەلمێنین بە پێی گۆڕانی جێگەی وشە لە ڕستەدا عینوان و دەوریشی دەگۆڕێ دەبێ بڵێین «برایم بەگ» یش ڕاناوە چونکە «برایم بەگ هات» دەشێ بکرێتە «باوکم هات». وشەکانی وەک ترێ، سێو، هەنار، هەرمێ، تەماتە، برنج... هتاد ئەوانیش دەبنە ڕاناو چونکە ئیمکان هەیە کە گوتت

«هەنارم کڕی» وشەی هەنارەکە بگۆڕی و بڵێی «میوەم کڕی»، میوەش وەک هەنار دەبێتەوە ڕاناو بە هەڵگێڕانەوەی میسالەکە. هەرچی پۆشاک و ئاژەڵ و سووتەمەنی و تەقەمەنی و پێڵاو و گوڵ و درەخت و چەک و پارە... خولاسە هەموو ئەوانەی پێیان دەڵێن «اسم الجنس» دەست دەدەن بە خۆیان و موفرەداتیانەوە ببنە ڕاناو. ئەمە لیستەیێک لە نموونەی ڕستە بۆ روون کردنەوەی مەبەس:

1- خەنجەرم کڕی، چەکم کڕی.
2- چوخەڵم لەبەر کرد، جلم لەبەر کرد.
3- وەنەوشەم دیت، گوڵم دیت.
4- سوتەمەنی دەکڕم، نەوت و دار و چیلکە دەکڕم.
5- فڵانەکەس هات، ئەحمەد هات.
6- مامم هات، ئەحمەد هات.

حەز دەکەی نیوەی وشەی فەرهەنگی کوردی بێنە و بیکە بە ڕاناو، پەکی تەعبیرت ناکەوێ و دەتوانی ڕستەیێک بێنیەوە بۆ ئەو ناوەی مەبەستە خۆی تێدا نەناسێتەوە یاخود سواری چەرخ و فەلەکی ڕستە گۆڕیی بکەی و هەر ساتە خۆی لە بارێک ببینێ.

بە ئانقەست نموونەی پێنجەم و شەشەمم هێناوە لە لیستەی سەرەوە تا ئەوانەی «فڵانەکەس» بە ڕاناو دادەنێن چاریان نەمێنێ و لێمان بسەلمێنن، لەبەرخاتری باوەڕەکەی خۆیان، مامم و ئەحمەدیش بە ڕاناو قبوڵ بکەن چونکە فڵانەکەس هەر خۆی مامم بوو هەر خۆی ئەحمەدیش بوو.

بە ڕاستی، دەردەکەوێ، ئەم ڕاناوە باری زمانزان سووک دەکا چونکە چ نامێنێتەوە نەبێتە ڕاناو و لە کۆڵ دەردی سەری دابەش کردنی ئاخاوتن دەبینەوە. سەیری، هەولێر و کەرکووک و ئەدیس ئەبابا ئاگایان لە خۆیان نیە

ئەوانیش ڕاناون، چونکە وەک دەتوانی بڵێی «هەولێرم دیت» دەتوانی هەولێرەکە بکەی بە شتێکی تر و بڵێی «ئاواییم دیت، شارم دیت، کۆمەڵە قەڵەباڵغیم دیت، کەونە شاری ئاشوورم دیت...».

وا دەزانم دیارخستنی چەندوچۆنی بەشەکانی ئاخاوتن بە گوێرەی حەقیقەتی واتای وشە، تاکە ڕێگەیێکە لە پێش زمانزان، چونکە تێکەڵ کردنی «حاڵەتی وشە و واتای وشە» هەموو حیسابان سەرەوبن دەکا. بۆ خۆت جارێکی تر سەیری سەرجوملەی ئەو وشانە بکە کە دەکەونە ناو جغزی ئەو حەفت جۆرە ڕاناوەی لێرە بە پێشەوە نووسیمن[9] ، دەبینی وشەکان هێندە لە یەکدی دوورن و بابەتی وەها جیاجیایان تێدایە لزوم نامێنێ وشەی تازە بە نموونە بێنینەوە بۆ دەرخستنی نادروستی ئەو تەقسیماتە. باوەڕ دەکەم تۆش لەگەڵ مندا سرنج بگری دەگەی بەو قەناعەتە کەوا هەرچەند بمانەوێ دوو بەشی لەیەکدی جودا لە ئاخاوتندا پەیدا کەین، وەک ئەو جوداییەمان بۆ نادۆزرێتەوە کە لە میانی وشەی «ئایا» و وشەی «فلان فیسار» دا هەیە. بە ڕاستی هەرگیز کار و چاوگ «فعل و مصدر» هێندی ئەم وشانە لە یەکدی دوور نین. لەگەڵ خۆتدا بڵێ «فلانەکەس... ئایا» و بە یەکدییان بگرە، ئینجا بڵێ «کردن، کردی – نووستن، نووست» و ئەمانیش بە یەکدی بگرە. ئینساف لێمان داوا دەکا چ دوودڵی نەکەین لەوەدا کە بڵێین «کردن و کردی» یەک شتن ئەگەر لە پێشەوە سەلماندبێتمان ئایا و فلانەکەس هەردوویان ڕاناو بن.

لە هەموو کارێکی زیهنیدا، کە زمان یەکێکە لە هەرە پێشەوەی ئەو کارانە، وردبوونەوە و قووڵ داگرتن و زەرڕەبینی مەرجی پسپۆڕی و وەستایی و شارەزاییە نەک پانبوونەوە بەسەر بابەتدا. مرۆڤ دەبێ ئاگای لە خۆی بێ بەر تەڵە و فاقەی ڕواڵەتی درۆزن نەکەوێ. تۆ ئەگەر ورد نەبیەوە، نەخێر ئەگەر تەلەسکۆپ بەکار نەهێنی، وا دەزانی ڕوی مانگ وەک ئاوێنەیێکی لەککەدارە، ئەوەندەش لەو ڕواڵەتە دڵنیا دەبی پاکانەی بۆ دەکەی و زۆر بەڵگەی ئەقڵی و مەنتیقیشی بۆ دەهێنیەوە. کە یەکێک لە ڕێی تەلەسکۆپەوە کەژ و دۆڵ و

لوتکه و گردۆڵکەی تێدا دیتەوە و وێڕای دۆزینەوەکەی ئاشکرا بکا، ڕەنگە هەر بە شێتی دانێی. بۆ میسال و بە نیازی ڕوون کردنەوەی بیرو باوەڕی خۆم، بەشی «ڕاناوی کەسی Personal Pronoun» کە بەلای هەموو زمانزانانەوە ڕاناوە و بە جێگری ناو دانراوە، دێنمە بەر سرنج و هەندێکی لێ ورد دەبمەوە لە گۆشەی نیگای خۆمەوە تا بزانین ئاخۆ ئەم چەند وشە بێگومان و بێفێڵە «من، ئێمە - تۆ، ئێوە - ئەو، ئەوان» کە ڕاناوی میراتین لە مێژووی کۆنەوە، هەموویان وەک یەکن و یەک قابیلەتیان هەیە لە جێگرتنی ناو و بەکارهێنانیان لە ڕستەدا؟

دەزانین ئەم کۆمەڵە وشەیە بە سێ بەش دابەش دەکرێن:

1- کەسی یەکەم «قسەکەر»، من و ئێمە.
2- کەسی دوەم، «قسە بۆ کراو»، تۆ و ئێوە.
3- کەسی سێیەم «قسە لێ کراو»، ئەو و ئەوان.

تا ئێرە گرفت نیە و بەدیهیەمان کوتاوەتەوە، جارێ باس لەوەش ناکەین وێنەیێکی تری ئەم وشانە هەیە کە پێی دەڵێن «ڕاناوی لکاو، ضمیر متصل» چونکە ئیشمان بەو باسە نیە لێرەدا، هەرچەند ئەویش بەر «بدیهیە» دەکەوێ و زانیاری بازاڕییە.

بەڵام دوای ئەم مەعلوماتە سادەیە، وردبوونەوە و پێوانە و کێشانەی لەسەرەخۆ ڕاستییێک دەردەخا کە ئەم کۆمەڵە وشەیە، گردەبڕ، دەکا بۆ دو کەرتی لەیەکدی جودا، جوداییەکەش وەک ئەوە نیە کە گۆڕانی حاڵەتی وشە لە ڕستەدا پەیدای دەکا، نەخێر جوداییەکە لە دەروون و قابیلیەتی وشەکاندایە:

سرنج بگرە لەم ڕستانە:

- من مرۆڤم — ئێمە مرۆڤین.
- تۆ مرۆڤی — ئێوە مرۆڤن.

ئەم ڕاناوانەی کەسی یەکەم و دووەم قبوڵ ناکەن هیچ ناوێک وەیا وشەیێک جێگەییان بگرێتەوە. راناوی «من» بۆ ڕستە پێک هێنان تەنها لەگەڵ جۆرە لکاوەکەی خۆی کە پیتی «م»ە دەبێتە «فاعل» یاخود «مبتدأ» یاخود «Subject» یاخود هەر شتێکی تر بێ، بە تەواوی خۆی لە قەبەڵ جۆری لکاوی کردوە هەر دەڵێی خۆی لە قەبەڵ خۆی کردوە. کە دەڵێم «من کوردم» ناتوانم هیچ وشەیێکی فەرهەنگی کوردی و غەیری کوردی لە جێگەی ئەم «من» ە دانێم تەنانەت کە ناوم «دارا» بێ و بشمناسیت ناتوانم بڵێم «دارا کوردم» هەروەها کە گوتم «تۆ ئازایت» ڕێم نیە بڵێم «قوتابی ئازایت» کە خۆت قوتابی بیت. هەڵبەت «ئێمە و ئێوە» ش وەک «من و تۆ» وان لە نەبوونی ئیمکانی هاتنی وشەی غەیری خۆیان بۆ جێگەیان لە ڕستەدا. ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەم و دووەم دەست نادەن، هەرگیزاوهەرگیز، ببن بە تەواوکەری ڕستە لەگەڵ غەیری ڕاناوە نەلکاوەکانیان. نەکا بە سەهوم بردبیت، یاخود تایبەتییێکی ئەم ڕاناوانەم لێ شاردبیەوە، دەبێ ئەوە بڵێم لە یەک حاڵدا ڕێ هەیە ڕاناوی لکاوی «ئێمە و ئێوە» دا، حاڵەکەش ئەمەیە کە لەم نموونەدا دەردەکەوێ، دەگوترێ:

- من و دارا و برزو شاگردین.
- دارا و برزو و تۆ شاگردن.

ئەم ڕێ دانە زیرەکیەکی گەورەی تێدایە چونکە هاتنی وشەی دارا و برزو لەگەڵ ڕاناوی «من» دا، فاعیلەکە یاخود «مبتدأ» ەکەی کرد بە «جمع» ناکرێ ڕاناوی لکاوی تاکی بەدوادا بێ، خۆ دیارە ناشکرێ «جمع» ێک بێ بە دوا ئەو فاعیلە وەیا «مبتدأ» ەدا کە کەسی یەکەمی تێدایە مەگەر ئەو جەمعە بۆ کەسی یەکەم بێ. نزیکی کەسی یەکەمی تاک لە کەسی یەکەمی

جەمع دەیانکا بە هاودەنگی یەکتر. کەسی یەکەمی تاک کە لەگەڵ کەسی یەکەمی جەمع تەنها لە ڕوی ژمارەوە جودایە، لەگەڵ کەسی دوەم و سێیەمی جەمع لە هەموو ڕوییێکەوە جودایە، حاڵی کەسی دوەمی تاکیش وەک کەسی یەکەم وایە ئەویش خزمە لەگەڵ جەمعی کەسی دوەم، هێندە هەیە کە دەڵێی «تۆ و برزو مرۆڤن» ڕاناوە لکاوەکەی «ن» بە ڕێکەوت بۆ جەمعی دوەم و جەمعی سێیەم هەر یەکێکە، هەڵبەت تۆ لە ڕستەدا مەبەستت جەمعی کەسی سێیەم نیە. سەیری، کە دەڵێی «تۆ و برزو نووسیتان» ڕاناوەکە هی کەسی دوەمی جەمعە نەک هی کەسی سێیەم، چونکە لە کاری تێپەڕدا ڕاناوی لکاوی جودا هەیە بۆ هەرکەسە.

ئینجا با بێینە سەروکاری سێیەم:

دەگوترێ:

- ئەو مرۆڤە        دارا مرۆڤە        کێ مرۆڤە؟
- ئەوان مرۆڤن        کورد مرۆڤن        هەموویان مرۆڤن.

ڕاناوی کەسی سێیەم دەست دەدا وشەی تر بێتە جێگاکەی، هەر بەو پێیەش ڕاناوە لکاوەکەی ببێتە تەواوکەری ڕستە. کەسی سێیەم، بەهۆی ئەوەوە کە خۆی غائبە، دەبێتە خزم لەگەڵ هەموو غائیبێک و دەشێ غائب جێی بگرێتەوە. لەوەش زیاتر، هەر لەبەرخاتری ئەو غائبانەیە ڕاناوی کەسی سێیەم دروست بوە. بەڵێ ڕاستە لە بنەڕەتا ڕاناوی «ئەو، ئەوان» بۆ مرۆڤ داهاتوە، ئێستاش کە دەڵێی «ئەو» بەر لە هەموو شتێک مرۆڤت بە بیردا دێ و حەز ناکەی لە ڕستەدا «ئەو» بە سەراحەت بۆ غەیری مرۆڤ بەکار بێ، بەڵام دوای داهاتنی ناچارە مل کەچ بی بۆ هەموو ئەنجامێک کە «غیاب» لێی دەوەشێتەوە. با لە موناقەشەی ئەوە گەڕێین ئاخۆ چۆن دەتوانین، یا ناتوانین،

ڕاناوی «ئەو و ئەوان» بۆ غەیری مرۆڤ بەکار بێنین، خۆ لە فەرهەنگدا چەندین وشە بۆ مرۆڤ بەکار دێن وەک تێکڕای «اسم علم» و ناوی گەل و کۆمەڵ و خزم و کەس و ئیشارە و پرسیار و «مبهم» و ئاین و حیزب و مەزهەب و نازانم چی، هەمووشیان غائبن وەک کەسی سێیەم «ڕاستییەکەی، ئەم وشانە کەسی سێیەمن، دو وشەی «ئەو و ئەوان» ڕاناوی کەسی سێیەمن». دەوجا کە ڕاناوێک دەلالەتی ئەو غائبانە بدا و لەبەر ئەوان پەیدا بووبێ دیارە جۆری لکاویشی دەبێتە تەواوکەری ڕستەکانیان.

ئەم تایبەتیەی «غیاب» کە لە ڕاناوی کەسی سێیەمدا هەیە و کۆی دەکاتەوە لەگەڵ هەموو «غائب» ێک لەو ڕووەوە کە هەرچی «غائب» هەیە ئەویش کەسی سێیەمە، ڕێی خۆش کردوە لەبەر خامەی زمانزانان بۆ لێک کێشانەوەی پەراوێزی «ڕاناو» تا ئەو هەموو وشەی لەیەک دوورە بگرێتە ناو باوەشی خۆیەوە. بۆ خۆت دەبینی وشەکانی شەش بەشی «ڕاناو» لەو حەفت بەشەی ژماردمانن کە حیساب کراون بە ڕاناو هەموو دەبنە ڕانوی کەسی سێیەم. ناتوانین یەکێک لەو وشانە بکەین بە ڕاناوی کەسی یەکەم یا دوەم «حیکایەتی خۆم، خۆت دواتر دێ». باوەڕ دەکەم ئەم «غیاب» ە خلیسکە لەبەر پێی زمانزان، دەبێ لێی بەپارێز بێ.

لەو کورتە سرنجەی لە ڕاناوی «کەسی، شخصی Personal,» مان گرت بۆمان دەرکەوت ئەو زمانزانەی لە ڕێی قابلیەتی هاتنی ناو بۆ شوێنی وشەیێک، وشەکە بکا بە ڕاناو، پەکی ئەوەی دەکەوێ «من، ئێمە - تۆ، ئێوە» بە ڕاناو دانێ چونکە مەعلوممان کرد هیچ ناوێک، وەیا غەیری ناویش، ناشێ جێگەیان بگرێتەوە لە ڕستەدا. پێی ناوێ بڵێم، لە خۆتەوە دەزانی، لەلانی ڕێزمانەوە واتای وشەکانی «من، تۆ...» کە دەلالەتی شەخسیان هەیە هیچ ئەوە ئیسپات ناکا کە ڕاناون چونکە دەستووری ڕێزمان لە چۆنەتی ڕەفتاری وشەوە وەردەگیرێ نەک واتای وشە. هەر وشەی «ڕاناو» بۆ خۆی ڕاناوی ڕێزمانی نیە، وشەی «فعل، کار» ئەویش فیعل نیە، ئاوەڵناویش ئاوەڵناو نیە.

که دەڵێی «ناوی من نووسرا» هەرچەند لە ڕووی واتاوە وشەی «ناو» لە ڕستەدا مەفعولێکە ئاو لێڵ ناکا، بە پێی دەستووری ڕێزمان پێچەوانەی مەفعولە. کە ڕستەکەت گۆڕی و کردتە «ناوی منی نووسی» ئەوسا وشەی «ناو» دەبێتە مەفعول.

کاکڵی گوتە، لێرەدا، ئەوەیە ئەگەر میقیاسەکانی کلاسیکی بکەین بە دیاردەی ڕاناو، دوو بەش لە سێ بەشی ئەو وشانەی تا ئێستا لای هەموو دونیا ڕاناو بوە لە «ڕاناوی» دەکەون، واتە وشەکانی «من، ئێمە - تۆ، ئێوە» بەر ئەو مەفهومە ناکەون کە «ئەو، ئەوان» دەکا بە ڕاناو.

جگە لەم تایبەتیە، تایبەتییێکی تری واتایش سەر لەنوێ کەسی یەکەم و دوەم جیا دەکاتەوە لە کەسی سێیەم. پەیوەندی کەسی یەکەم و دوەم بە مرۆڤەوە گەلێک بەتینترە لە هی کەسی سێیەم، چونکە وەک بەدیهیە ئاشکرایە لە مرۆڤ بەولاوە مەخلوقێک نیە قسە بکاو بڵێ «من وام کرد، ئێمە ڕۆیشتین»، بە نیسبەت کەسی دوەمیشەوە دیارە لە بنەڕەتا مرۆڤ وتوێژی هەر لەگەڵ مرۆڤ بووە، دوایی بە پێی پەرەسەندنی مامڵەتی مرۆڤ لەگەڵ جیهان و فرەوانبوونی جغزی ئاخاوتنی، غەیری مرۆڤیش بوە بە کەسی دوەم.

سرنج بدە تا ئێستاش بە دەگمەن و لە حاڵی تایبەتیدا نەبێ راناوی «تۆ، ئێوە» بۆ دار و بەرد و ئاژەڵ و چشتی ئەوتۆیی بەکار نایێ. ئەم لەقەبەڵبوونەی ڕاناوی کەسی یەکەم، تا ڕادەییێکیش کەسی دوەم، بۆ مرۆڤ سروشتی وشە داخوازی دەکا نەک دەستووری زمان. واقیع وایە مرۆڤ نەبێ ئاخافتن ناکا، بەڵام ڕێزمان مانیعێکی نیە لەوە کە هەرچی هەیە لە جیهاندا بە دەنگ بێ و بئاخێوێ، ئەوساش قسەکەر مرۆڤ بێ یا گۆچان، فیعلی ڕابردوو یەک دارِشتنی دەبێ بۆ هەردوویان و دەگوترێ «من بێزام، من چەمام».

خۆت دەزانی وشەی پرسیار لەبارەی ئادەمزادەوە «کێ» یەو لەبارەی غەیری ئادەمزادیشەوە «چی» یە، بەڵام لە ڕستەدا چ فەرقێک نیە لە میانی بەکارهێنانی «کێ، چی» و دەڵێی «کێ هات، چ قەوما». زمانزان دەبێ خۆ بپارێزێ لە تێکەڵ کردنی فەلسەفە و زمان و ئاگای لە خۆی بێ دەستووری فەلسەفە و مەنتیق و لێکدانەوە هەموو دەبنە ئەمرازی دۆزینەوەی یاساکانی زمان نەک یاساکە خۆی. دەبینی هەندێ زمان سوورن لەسەر جیاکردنەوەی نێر و مێ، زیاتر لە جیاکردنەوەی تاک و گەل لە ئاخافتندا کەچی زمانێکی تر ئەمەی نەکردوە، خۆ مەعلومیشە مەنتیق و زانست و فەلسەفە یەک نرخاندنی هەیە بۆ ئەم شتانە و چ گوێ ناداتە دەستووری زمانەکان، سەلیقەی هەر میللەتە بە پێی ئەو زەرفە مێژووییە کە تێیدا ژیاوە ڕێگایەکی گرتۆتەوە بەر بۆ دەربڕینی واتا و داڕشتنی گوتە، لەو کارەشدا دەستووری وەهای داناوە کە لەگەڵ سروشت و تایبەتیەکانی خۆی ڕێک کەوێ، با بڵێم مەنتقێکی زادەی سەلیقە و زەرفی ئاخاوتنی پەیدا کردوە کە زۆر جاران لەگەڵ مەنتیقی فەلسەفە و زانستی ڕووت ناگونجێ. بەلای منەوە ڕواڵەتێکی بێ هێز و پێزی وەک ئەوەی وشەی «فلان» دەتوانێ جێی خۆی چۆڵ کا بۆ «دارا» هەرگیز بە مەنتیقی زمان غەلەبە ناکا لەسەر ڕاستییێکی زۆر بەهێز و پێز کە سروشت و واتای وشەکە خۆیەتی. ئەم ڕواڵەتە لە مەنتقێکی دەرەوەی زمانەوە، کە مەنتیقی لێکدانەوەی زمانزانانە و بەسەر زمانیاندا سەپاندوە، بایەخی زیاد لە مافی خۆی وەرگرتوە و هەندێ ڕێچکۆلەی زمانی تەماویی کردوە.

یەکێک لەو بڕیارە غەڵەتانەی کە لە مەنتیقی دەرەوەی زمانەوە بەسەر ڕێزمانی کوردیدا براوە، ئەوەیە کە دەگوترێ چونکی کوردی لە زمانەکانی هیندی – ئەوروپاییە نابێ ڕستەی بێ فیعلی تێدا بێ، هەر لەو بڕیارە غەڵەتانەوە گەلێک ڕاست بە هەڵە دانراوە و گەلێک هەڵەش کراوە بە دەستوور. ئەو زمانزانانەی بڕیاری وایان داوە گوێیان نەداوەتە واقیعی سەربەخۆی هەر زمانێک لە خێزانی هیندی – ئەوروپایی، بەڵکو مەیلە و بە

پەلە ڕواڵەتێکی بەرچاوی هەندێک لە زمانانی ئەو خێزانەیان پان کردۆتەوە بەسەر هەموو زمانەکانی و بێ دوودڵی کردویانەتە دەستوورێکی گشتی.

گومانم نیە لەوەدا بڕیاری باس لێکراو ئەو غەڵەتە گەورە بەناوبانگەی تێدایە کە لە «اصول الفقه» پێی دەڵێن «مصادرة[10]علی مطلوب» چونکە بڕیارەکە هەڵوەستێکی نارەوا و ناڕاست دادەهێنێ بۆ دزینەوە و دەست بەسەرداگرتنی ئەو مەوزوعە کە جێی موناقەشە و دەمەتەقەیە. خۆ ئێمە جارێ نەمانسەلماندوە هەموو زمانێکی هیندی – ئەوروپایی لەو بابەتەن تا بسەلمێنن کوردیش لەو بابەتەیە، موناقەشەی ئێمە لەسەر ئەوەیە ئایا لە کوردیدا ڕستەی بێ فیعل هەیە یا نیە کەچی بڕیارەکە هەر لە پێشەوە دەستی بەسەر مەوزوعدا گرت و بێ ئەوە لە کوردی بکۆڵێتەوە ڕستەی بێ فیعلی لێ یاساغ کرد. چ فەرقێک نیە لەوەدا یەکێکی تر بێ و بڵێ «چونکە لە کوردیدا ڕستەی بێ فیعل هەیە دەبێ لە هەموو زمانەکانی هیندی – ئەوروپاییش ڕستەی بێ فیعل هەر هەبێ» هەڵبەت ئەمەش هەر «مصادره» یە چونکە جارێ نە ئەوە سەلمێنراوە کە لە کوردیدا ڕستەی بێ فیعل هەیە و نە ساغیش بۆتەوە هەموو زمانەکانی تریش تێیاندا هەیە.

بەلای باوەڕی منەوە وەک بەدیهیە وایە کە کوردی ڕستەی بە فیعل و بێ فیعلی تێدایە و هەر لەو حاڵەتەدا ڕستە بێ فیعلەکانی نابینین کە بە چاویلکەی خوازرایەوەی زمانزانەکانی بێگانە سەیری زمانی کوردی بکەین. ئینکار کردنی هەبوونی ڕستەی بێ فیعل لە کوردیدا ئەو خلیسکەمان پێ دەبا کە، کوردی گوتەنی، تەوقی سەری ڕێزمانەکەمان بە ئەرز دەکەوێ، چونکە بەشێکی گرینگ لە بنج و بناخەی زمانەکە هەڵدەتەکێنێ. فەرموو سەیری ئەم میسالانە بکە و بە دوا ئەودا سرنج بگرە لە ئەنجامی نەسەلماندنی هەبوونی ڕستەی بێ فیعل لە میسالەکاندا، دەگوترێ:

- من پاک بووم.

- من پاک دەبم.

ڕستەی یەکەم سیغەی ڕابردو و ڕستەی دوەم داهاتوی کاری «بوون» ە و دەتوانی وشەی پاک هەڵگری و بڵێی «بووم، دەبم» هەروەک دەڵێی «نووستم – دەنووم، خواردم – دەخۆم». لەم ڕستانەدا فیعل هەن و جێی دەمەتەقە نین.

ئنجا سەیری ئەم ڕستەیە بکە:

- من پاکم.

لێرەدا کام بەشی ڕستە فیعلە؟ هەڵبەت دو وشەی «من، پاک» نە کەس دەڵێ فیعلن و بە زۆرەملێش نابنە فیعل. ئەوەی دەمێنێتەوە لە ڕستەکەدا و دەکەوێتە بەر هەست تەنها پیتی «م» ە، ئاخۆ ئیمکان هەیە پێی بگوترێ فیعل؟

تاقمێک لە زمانزانەکان خۆ لەوە لا دەدەن بەو تەرزە بەشەی ئاخاوتن بڵێن فیعل چونکە لە حیسابی وانیشدا بە ڕاناو دانراوە، بەڵام کۆڵیش نادەن لە دەعوای هەبوونی فیعل لە ڕستەی کوردیدا ئیتر دەڵێن لە میانی کۆتایی وشەی پاک و پیتی «م» دا دەنگێکی بێهێز هەیە ئەو دەنگە فیعلە. ئەم دەعوایە نەک جارێک، چەندین جاریش ڕەش دەبێتەوە و لەبەر یەک هەڵدەوەشێ و بەسەرخۆیدا دەتەپێ بێ ئەوە ئەرکێکی چەندان بە خەرج بدەین:

ئەگەر ئەم دەنگە بێهێزە فیعل بێ کەواتە دەبێ لە «مضاف و مضاف الیه» شدا فیعل هەبێ چونکە ئەو دەنگە بێهێزەی تێدایە، وەک دەڵێی «کوڕم، کچم، خێزانم». با لە ئیزافە گەڕێین و بلکێین بە هەمان میسال کە هێنامانەوە، بەڵام ئەمجارەیان کەسی یەکەمی جەمعی بۆ بەکار بێنین ئەوسا

دەڵێین: «ئێمە پاکین». دەبینی لێرەدا پیتی «ک» چ بزوێن و دەنگی بێهێزی بەدوادا نایێ و ڕاستەوخۆ ڕاناوی «ین» دەکەوێتە شوێنی، کەواتە ئەو خۆ هەڵفڕیودانەش جێگەی نەما کە لە میسالەکەی پێشوودا جنجڕۆکی مرۆڤی نەسەلمێنی لێ گیر دەبوو.

دیسان با واز لە جەمع بێنین و بادەینەوە سەر میسال بۆ کەسی یەکەمی تاک وەک میسالەکەی «من پاکم». دەڵێی «من ئازام – من خەڵقی لادێم – من ئامادەم – من کاکە برزوم...» لەمانەدا چ دەنگێکی بێهێز نیە لە میانی کۆتایی وشەکان و ڕاناوەکە تا وەهمی جنۆکاویش گومانی ڕاناوی لی بکا.

ڕاستی، ئەم دەنگ بێهیزە کە دێتە ناو ڕستەی وەک «پاکم» لە ناچارییەوە دێ، چونکە تۆ ناتوانی «تلفظ» بکەی بە پیتی «کاف» ی وەستاو و بە دوا ئەودا «میم» ێکی وەستاو بێنی، چ عەلاجت نیە دەبێ «کاف» ەکە قورس کەی بۆ درکاندنی «میم» ەکە. لێرەدا تۆ پیتی «میم» لە دەرەوەی وشەوە دێنی و دەیلکێنی بە وشەکەوە کە ئەمە سەرلەنوێ ناچارت دەکا «کاف» ەکە قورس کەی تاکو مەعلووم بکرێ لەوێدا وشە کۆتایی دێ. وا هەیە لەناو خودی وشەکەدا ئەم قورس کردنەی پیتی پێش کۆتایی وشە دەبێتە کاری ناچاری چونکە هەندێک پیت کە کەوتنە پێش هەندێکی ترەوە ئیمکان نیە بە وەستاوی «سکون» تەواوەوە «تلفظ» بکرێن. کە گوتت «کرم» بۆت ناکرێ «رێ و میم» ەکە هەردوان بە جارێ بوەستێنی، هەڵبەت دەبێ یەکێکیان قورس کەی، کە مەعلوومە پیتی «رێ» یەو «میم» نیە چونکە «میم» ەکە کەوتۆتە کۆتایی وشەوە و جێگەی خۆی هی وەستانی تەواوە. هەروەها کە دەڵێی «شەکر» دەبێ «کاف» ەکە قورس کەی. هەندێ دەنگ هەیە هەردوو حاڵەتان هەڵدەگرن، واتە وەستانی تەواو و قورس کردن، وەک کە دەڵێی «دەنک» دەتوانی «نون» ەکە بوەستێنێ و دەشتوانی قورسی کەی. واش دەبێ پیتی پێش کۆتایی وشە قورس کردن هەڵناگرێ وەک «دەنگ، ڕەنگ، ماست، بیست، مەرد، بەرد، کەرت، شەرت...». کورتەی قسە ئەوەیە

ئەم دەنگە زۆر بێهێزە کە وا دەبێ پێی دەڵێن «کسرة مختلسه، Stress، قورس کردن – من پێی دەڵێم بزوێنی بێ تەرەف» چ پەیوەندییێکی نیە، کەم و زۆر، بە ڕێزمانەوە و کارێکی سەر بە زانستی «فۆنێتیک» ە . تاکو ئێستاکەش کەس دەرسی دەنگەکانی زمانی کوردی نەکردوە لە ڕووی قابلیەتی هەر دەنگێک بۆ وەستاندنی لە پێش دەنگێکی وەستاوی ترەوە. من بە شێوەییێکی سەرەتایی نەختێک لە مەوزوعەکە تێفکریوم، ڕەنگە تا ڕادەییێک گەڵاڵەی نیمچە دیراسەییێکیشم کردبێ، بەڵام هێشتا لێکدانەوەکانم نەخستۆتە سەر یەک و ڕێکم نەخستون، سەرەڕای ئەوە کە وا جارێ زۆریشی بە بەرەوە ماوە.

کەواتە دڵ خۆش کردن بەو ڕواڵەتە بێ بایەخە لە کارێکی وا گرنگدا، کە بڕیار دانی بوون و نەبوونی فیعلە لە ڕستەی کوردیدا، جگە لەوە کە هەرچی زانستی زمانە و هەرچی هۆش و هەست و مەنتیقە گاڵتەی پێ دەکا، هەر خۆی، واتە ئەو دڵ خۆش کردنە، نیشانەی بێ بایەخ کردنی ڕێزمان و دەستوورەکانیەتی چونکە قبوڵ کردنی ڕواڵەتی بێ هێز و بێ دەلالەت و بێ نرخ بە بەڵگەی زمانەوانی بۆ ئیسپات کردنی مەسەلەییێکی زلی ڕێزمان هەرچی متمانییە نایهێڵێ و دەمانباتە سەر ئەو قەناعەتە کە وا ڕەنگە لە هەموو سەرەباسەکانی ڕێزماندا تۆژینەوەی وەها سەراویی بەکار بێ و بەکار هاتبێ... با ئەم ڕووپەڕەیە لێرەدا وەرگێڕین و چی تر بە دوای نەکەوین چونکە ئەوە ناهێنێ یەک هەنگاوی تری بۆ هەڵێنین.

هەندێک لە زمانزانان ڕاناوی «م» لە ڕستەی وەک «من پاکم» بە فیعل دادەنێن، واتە بەلای وانەوە هەموو ڕاناوە لکاوەکان لەو ڕستانەدا کە بێ فیعلن خۆیان فیعلەکەن و کاتی «ئێستا، حاضر» دەبەخشن. ئەم تاقمە دەڵێن «میم» ی ڕستەی «من پاکم» وەک «am» ی زمانی ئینگلیزی وەیا «sui» زمانی فرەنسی وایە کە حاڵەتێکی «فعل الكينونه، verb to be» یە واتە ئەو وشانەی کە بە ڕاناو دادەنرێن لە ڕستەی «من پاکم، ئێمە پاکین، تۆ

پاکی، ئێوە پاکن، ئەو پاکە، ئەوان پاکن» دەبێ سیغەی ئێستاکەی فیعلی «بوون، کینونە» بن، گۆیا ڕابردوو «من پاک بووم»، داهاتوو «من پاک دەبم» بێ.

ئەم باوەڕە نەختێک لە باوەڕەکەی پێشووتر کاملْترە لەو ڕووەوە کە هەر نەبێ وەک کەسێک لافاو ڕامالْی دابێ دەیەوێ دەست بە بنچکێک وەیا لکە دارێکەوە بگرێ. بەلاّم بە داخەوە ئەویش لە لای خۆیەوە کارێک دەکا بە زمانەکەمان با بە دەواری شڕی نەکردبێ.

کە گوترا ئەو «میم» ەی کۆتایی ڕستەی «من پاکم» فیعلە نەک ڕاناوە، ئەوسا دووچاری مەتەڵی ئەوتۆ دەبین لە زمانەکەماندا بە کەس هەڵنەیێ، چونکە ڕاستەوخۆ بەو حەقیقەتە ڕەق و تەقە دەکەوینەوە کە هەمان «میم» لە کۆتایی فیعلیشەوە دێ وەک «گوتم، ڕۆیشتم، دەبینم، بکەم...» بەو پێیە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە لە کوردیدا یەک «فیعل» دو فیعلی تێدایە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا گەپێکی سەیرە، ئێسکیشی سووک نیە، ئینجا تێ دەمێنین بە دەست ئەو «استحالە»ەوە کە بەکەس ناکرێ لە ڕستەی «ڕۆیشتم» دا واتەی فیعل بەسەر ئەو «میم» ە بێ گوناهەدا بسەپێنێ، ئەوساش «میم» ەکە دەبێتە «فعل و نافعل». لەوەش سەیرتر حاڵی «میم» ەکەیە کە دەبێتە «مضاف الیە» وەک کە بڵێی «بارامی کوڕم» لێرەدا هەر بە جارێ پەکی هۆش و گۆشی هەموو زمانزانینێکمان دەکەوێ چونکە لە «اضافە» دا چ پێویستێکمان نیە بە فیعل. خۆ ئەگەر هات و گوتم «من براتم» ئەوسا «تێ» یەکە و «میم» ەکە هەردووکیان، خۆشی بێ و ترشی بێ، دەبنە فیعل هەرچەند ئیمکان نیە بە شرینقەش واتای فیعلیان تێ بکرێ. دەمێنێتەوە بڵێین ئەو «میم» ە و هاوڕێکانی هەر لە حاڵێکدا بە فیعل دادەنرێن کە لە ڕستەدا فیعلی بەرچاو نەبێ، واتە کە گوتمان «من کوڕم» لێرەدا «میم» ەکە فیعل بێ تاکو ڕستەکە نەبێتە ڕستەی بێ فیعل، کە گوتیشمان «بارامی کوڕم ئەمەتە!» با لێرەدا «میم» ەکە ڕاناو بێ یا هەرچی

دەبێ با ببێ هەر فیعل نەبێ، بەو گوێرەیە دڵمان تەسکین دەبێ بە نەهێشتنی «تناقض» و بێ مەنتیقی لە بڕیار و دەستوور و لێکدانەوەی زمانزانیمان. خولاسە بۆ خاتری سەپاندنی بوونی «فعل» لە هەموو ڕستەیێکی کوردیدا پێویستمان هەیە بە هەندێک چاوپۆشی و لەبیر خۆ بردنەوە و هۆش خەواندن، ئەگەر وا نەکەین دوچاری ئەوە دێین کە دان بنێین بە بوونی ڕستەی بێ فیعل لە زمانی کوردیدا، ئەوساش مەبدەئە پیرۆزەکەی «هەموو زمانەکانی هیندی – ئەوروپایی هەر ڕستەی بە فیعلیان هەیە» کەلێنی تێ دەکەوێ، یاخود هەر بە جارێ سەرەو بن دەبێ، ئیتر لەوە بەولاوە خوا دەزانێ کورد و زمانی کوردی چیان بەسەر دێ....!!. بە دەست خۆم نیە لێرەدا بە نیسبەت لە ناوچونی ئەو مەبدەئەوە قسەی کابرای شارەزووریم بە بیردا دێ کە گوتی «دەمرێ نامرێ ملی وەقوتەوە».

زمانی کوردی نە زیاد دەکا نە کەم دەکا بەوە کە هەموو دەستوورەکانی لەگەڵ هەموو زمانەکانی هیندیی – ئەوروپایی ڕێک بکەوێ یا ڕیک نەکەوێ. من تەعەصوبێکم نیە، نە بە لایەنگیریی نە بە دژکاریی، بۆ هەر ڕاستییێک کە لە تۆژینەوە دەربارەی زمانەکەمان ئاشکرا دەبێ، تەعەصوبێکم کە هەبێ بۆ ڕاستییەکە خۆیەتی.

من وا لەبەرچاومە هەر هەمان ڕاناوی لکاو کە بە دوا فیعلدا دێ لە کۆتایی ئەو ڕستەیەش دێ کە فیعلی بەرچاوی تێدا نیە، ئینجا دەبێتە «مضاف الیه» و کارا و بەرکار و بە دوا ئەو ئەمڕازانەشدا دێ کە پێیان دەگوترێ «Preposition»:

- من هاتم.
- من کوڕ.
- دارای کوڕم هات.
- لێم گەڕێ.

- پێم بڵێ.
- بمبینە.
- دەتاندیتم.
- مەمخەرە هاویەیی هەوڵی فیراق.
- دەستم تێ مەدە هەر خۆم ئاگرینم.

لە هەموو ڕستەکاندا «میم» ەکە وەک خۆی دێتەوە بێ ئەوە زەرەرێک لە واتا و سروشت و تایبەتیەکانی زیاد و کەمی کردبێ ئیتر بە چ مافێک و ئینسافێک بە مرۆڤی کورد بڵێم: براکەم ئەم «میم» ە لە فلانە ڕستەدا شتێکی جیاوازە لە «میم» ەکانی تر، خۆ ئەگەر قەناعەتیش نەیێ، کاکی کورد، دەبێ لەبەر خاتری من خۆت ئیقناع کەی… بە ڕاستی ئەمە کاری کردن نیە.

دوای ئەمە سەر لەنوێ دەبێ خۆم و خەڵقیش هەڵبفرێوێنم بەوە کە بڵێم ئەم «میم» ەی ڕستەی «من کوڕم» هەمان «am» ی «فعل الكینونه» ی « I am a boy» ە هەروەهاش دوو پیتی «ین» لە ڕستەی «ئێمە کوڕین» «فعل الكینونه» ی «are» ە لە ڕستەی «we are boys» دا. وەی کە دور دەکەوینەوە لە جەرگەی زمانی کوردی و خۆمان لە تایبەتیەکانی کوێر دەکەین بە قسەی ئەوتۆیی.

لە ئینگلیزیدا ئەم «is, am, are» ە بە ڕاستی «فعل الكینونه - Verb to be» ن و «تصریف» دەکرێن و لە ماضیدا دەبنە «was, were»:

- I am
- I was
- We are
- We were
- He is
- He was

ڕاناوە لکاوەکانی کوردی ئەم «تصریف و ماضی و مضارعە» یان نیە چونکە فیعل نین تا هەیانبێ. ڕێکەوت وایە ڕاناوی کەسی یەکەم لە کوردیدا کە «میم» ە نەختێک لە « am» ی ئینگلیزی دەچێ خۆ هەموو ڕاناوەکانی تر زۆر و کەم پێک چونیان نیە لەگەڵ «am, is, was, were». کە دەڵێی «ئێمە کوردین» چ شەباهەتی تێدا نیە لەگەڵ ڕستەی «We are Kurd»، واتە ڕاناوی «ین» لە کوێ و فیعلی «are» لە کوێ. هەر ڕاناوی «میم» خۆی چ ناشوبهێتە «sui» کە «فعل الکینونە» ی کەسی یەکەمی تاکە لە فرەنسیدا، خۆ فرەنسیش وەک ئینگلیزی و کوردی یەکێکە لە خێزانەکەی «هیندیی – ئەوروپایی».

لە ئینگلیزیدا ڕاناوی لکاو نیە وەک لە کوردیدا هەیە، تەنانەت هەموو فیعلەکانی یەک سیغەیان هەیە بۆ هەموو کەسەکان، تەنها لە «مضارع» ی کەسی سێیەمی تاکدا پیتێکی «S» دەلکێ بە کۆتایی فیعلەکەوە. تۆ سەیر کە کە دەڵێی «I was» ڕاناوێکی نەلکاو و فیعلی «کینونە» ت بەکار هێناوە، بەڵام لە کوردیدا کە دەڵێی «من بووم» ڕاناوی نەلکاوی «من» و «فعل الکینونە» ی «بوو» و ڕاناوی لکاوی «م» ت هێنا دەوجا کە «م» ەکە بۆ خۆی «فعل الکینونە» بێ ئەی فیعلی «بوو» دەبێ چی بێ؟

پوختەی قسە لە سەرلەبەری ئەم مەوزوعە ڕادەگەیەنێ کە وا لە ڕستەی وەک «من پاکم، لێمرا دیارە، تۆ برای منی، هەمووومان کوردین، سەیری[11] چەند جوانە، دارا کوڕی ڕۆستەمە، ناوی سالم عەبدوڕڕەحمان بەگە، ڕەواندز بەسەر خەرەندەوەیە...» و هەزاران ڕستەی ئەوتۆیی لە زمانی کوردیدا نە هیچ فیعلێکی نهێنی تێدایە نە عەقڵ دەیسەلمێنێ ئەو بەشەی پێی دەگوترێ «ڕاناو» لە ڕستەکاندا فیعل بن چونکە هەروەک مراوی کەرکەدەن نیە ئەمانەش فیعل نین، کە بە زۆرە ملەش کردمانە فیعل هەرچی دەستووری بنجی هەیە بۆ پێکهێنانی ڕستەی تەواو لە کوردیدا لەگەڵ هەوەڵ تەکانی ئەم زۆرە ملەیەدا پەڕەم بە پەڕەم دەبێ و زمانی کوردی ئەوە نامێنێ کە هەیە،

دەبێ ڕێزمانێک ساز دەین ئەوەندە پڕ فەند و فێڵ و ساختە و تەئویل بێ بایی ئەوە بکا هەر نەبێ لە ڕواڵەتدا پەردەیێکی درۆزن بخاتە سەر ئەو هەموو ئیعتیرازانە کە دێنە سەری و ڕێی پێ دەگرن. بە نموونە دەڵێم کە گوترا ڕاناوەکان فیعلن ئەوسا دەبێ تەعریفی فیعل دەسکاری بکرێ تا ئەوانیش بگرێتەوە، تەئویلیش بێتەوە بۆ نەبوونی ئاوەڵکار «ظرف» ی ئەوتۆ لەگەڵ واندا بگونجێ، شەوەها و ڕۆژەهاش خەریک بین تەوجیهێک بێنینەوە بۆ گۆڕانی ئەو وشانە لە ڕاناوەوە بۆ فیعل، لە فیعلەوە بۆ ڕاناو و لە خەڵق بەگەینین چۆن «میم» ی ڕستەی «من پاکم» فیعلە و هی ڕستەی «ڕۆیشتم» ڕاناوە.

چ سەرپێچی پێ ناوێ، لزوم بە دوودڵیش ناکا لەوەدا بێ پەروا و بە قەناعەتێکی تەواوەوە بڵێین ڕستەی بێ فیعل لە کوردیدا هەیە وەک ڕستەی فیعلدار. ئەوەی ئیمکانیشی پەیدا کردوە ڕستەی بی فیعل هەبێ ڕاناوە لکاوەکەیە بە خۆی و توانای زۆر سەیرییەوە بۆ دروست کردنی «حکم، اسناد» لە ڕستەدا. لە کوردیدا ڕاناوی لکاو ئەوەندە کاریگەرە نەک هەر لە ڕستەی بێ فیعلدا «اسناد، حکم» هەڵدەستێنێ، فیعلیش، بە دەگمەن و لە هەندێ سیغەی تایبەتی نەبێ، بێ ڕاناوی لکاو کار ناکا بە تایبەتی لە لەهجەی کوردستانی ژێرووەدا کە وا خەریکە خۆ دەسەپێنێ وەک شێوە زمانی ئەدەبی کوردی. زمانزانیک کە سرنج بگرێ لە بەشەکانی زمانی کوردی و ڕۆڵی هەر بەشە لە ئاخاوتندا بێنێتە بەر هەست و هۆشی خۆیەوە زوو لەوە دڵنیا دەبێ کە وا ڕستەی بێ فیعل هەیە و پڕی زمانی کوردییە، سەر لە نوێ پرسیارێکی تریش لە خۆی دەکا و دەڵێ ئایا دەشێ لە کوردیدا ڕستەی تەواوی بە «اسناد» پەیدا بێ بێ ڕاناوی لکاو؟ بەلامەوە لێرەشدا قەناعەت پەیدا دەکا بەوە کە وا هاتنی ڕاناوی لکاو بۆ ناو ڕستەی بە «اسناد» دەستوورێکی بنجی و گشتییە لە زمانی کوردیدا، تەعلیلێکیش پێویست دەبینێ بۆ نەبوونی ڕاناوی لکاو لە زۆرینەی فیعلی کەسی سێیەمی تاک و لە سیغەی «فەرمان، أمر، طلب، ویستن» بۆ کەسی دووەمی تاک. دەبێ پرسیاریک لە خۆی و سروشتی

زمانەکەی و مەنتیقیش بکا هۆی نەبوونی ڕاناو لە فیعلی وەک «هات، فڕی، ڕما، مرد، بڕۆ، وەرە، بڵێ، بخۆ، بژی» چیە و بۆ ئەم فیعلانەی کەسی سێیەم و دووەمی تاک بێ ڕاناون؟ هەوڵ دەدەم لەم نووسینەمدا، ئەگەر زێدە لە تەحەمولی بارستی گوتار درێژ نەبێتەوە، بە پێی تێگەیشتنی خۆم وەرامی ئەم پرسیارە بدەمەوە.

نووسەرم دیوە لە کوردیدا بە ئاسایی و بی خۆماندوو کردن و بەڵگە هێنانەوە گوتوەتی ئەم بزوێنەی کۆتایی ڕستەی وەک «دارا مەردە» کە دەبێتە هۆی «اسناد» لە ڕستەدا هەمان فیعلی «کینونە» یە کە لە فارسیدا بە وشەی «است» دەردەبڕێ، ئەوەشی خستۆتە سەر قسەکانیەوە بۆ پتەو کردنی باوەڕەکەی کە وا لە هەندێ شێوەی کوردی ڕستەکە بە تەواوی خۆی لە فارسی نزیک دەکاتەوە و دەبێتە «دارا مەردەس». زمانزانێک کە لەبەر تیشکی چاو غەڵەتێنی «دارا مەردەس» بگا بەو قەناعەتە کە لەو جۆرە ڕستانەدا کورد و فارس «مەردە، مەردەس – مرداست» یان لە یەک سەرچاوەوە هەڵێنجاوە دەبوا پرسیارێک لە خۆی بکا و بڵێ لە فارسیدا ئەم «است» ە هەر بۆ کەسی سێیەمی تاک بەکارنایێ، بۆ هەموو کەسەکان بەکار دێ و دەگوترێ «مرداستیم، مرداستم، مرداستی، مرداستید، مرداستند، مرداست» ئەدی بۆ لە کوردیدا هەر بۆ کەسی سییەمی تاک، ئەویش لە هەندێ لەهجەکانی، ئەم «است» ە تارماییێکی دەدیترێ؟ بۆ ناگوترێ «من مەردەسم، تۆ مەردەسی، ئێمە مەردەسین...»؟

لێرەدا پەردەیێک لەسەر مەوزوع هەیە دەبێ لابرێ ئینجا خۆی بە دەستەوە بدا. لە فارسیدا کە بڵێی «منم – بە ئیملای کوردی مەنەم دەنووسرێ» وەک ئەوەیە لە کوردیدا بڵێی «منم» . کە گوتیشت «من هستم» ئەم گوتەیە لە کوردیدا دەبێتە «من هەم». ئەم سیغەیەی «منم – مەنەم» بۆ هەموو کەسەکان بەکار دێ وەک خۆی، تەنها بۆ کەسی سێیەمی تاک نەبێ. دەڵێی «منم ، توئی، مائیم، شمائید، ایشانند» بەڵام بۆ کەسی سێیەمی تاک

دەبێتە «اوست – دیارە کورت کراوەی أوهست»ە. سیغەکەی تریش هەروەها بۆ هەموو کەسەکان دێتەوە و دەگوترێ «من هستم، ما هستیم، تو هستی، شما هستید، أو هست، ایشان هستند»

کوردیش هەر وەک فارسی دو سیغەی هەیە: منم، ئێمەین، تۆی، ئێوەن، ئەوە، ئەوانن.
من هەم، ئێمە هەین، تۆ هەی، ئێوە هەن، ئەو هەیە، ئەوان هەن.

لەمەڕا دیار دەکەوێ کورد کە دەڵێ «دارا مەردە» ڕستەیێکی کوردی پەتی بەکارهێناوە، ئەمرازێکیشی[12] بۆ دروست کردنی «حکم و اسناد» ەکە هێناوەتەوە کە نەک هەر کوردییە و بەس بەڵکو یەکێکە لە دو سیغەی کوردی ڕەسەن کە تا ئێستاش بە جووتە زیندون و هەریەکەیان کارێکی تایبەتی دەکا. بەو پێیە «دارا مەردە، من مەردم» لە «دارا مرداست، من مرداستم» وەرنەگیراوە، لەو دوو ڕستەیەی کوردیش وەرنەگیراوە کە گوترابا «دارا مەرد هەیە، من مەرد هەم» زۆر ئاشکرایە ڕاناوەکانی «ە، م» شتێکی جیان لە «هەیە، هەم». ڕاستیەکەی «هەیە و هەم و هەین و هەن...» بەولای «حکم و اسناد» ی «مطلق» شتێکی بە زیادەوەیان تێدایە کە واتاکەیان ڕاستەوخۆ دەکاتە «مەوجودە، مەوجودم، مەوجودین...».

بەڵام لێرەدا ڕوون کردنەوەیێک پێویستە بێ درێژە پێدان، چونکە نە ئەو دەرفەتە هەیە نە ئەو تۆژینەوە کراوە ڕێی درێژ کێشانەوە بد.

لە فارسیدا سیغەی «هستم، هستیم» هەر بۆ حاڵی حازر هەیە نە لە ڕابردوو، نە لە مضارعدا پەیدا نابێ. لە ماضیدا دەبێتە «بودم» لە مضارعدا دەبێتە «می شوم». لە کوردیدا بە نیسبەت مەوزوعەوە دوو تێبینی دێتە پێش:

1- «هەم، هەین» مازیشیان هەیە و دەگوترێ «هەبووم، هەبووین، هەبووی، هەبوون، هەبوو، هەبوون». لە تەسریفەکەشڕا دیارە فیعلەکە تێنەپەڕە، چونکە ڕاناوی تێنەپەڕی بۆ بەکارهاتووە، خۆ لە گوێرەی واتاکەی هەر ئەمیش چاوەڕوان دەکرا.

2- فیعلی «هەبوون» بە واتای «تملک» یش بەکار دێ، بەڵام ئەوسا جۆری لە کارهێنان و تەسریفی دەگۆڕێ. بۆ حازر دەگوترێ «هەمە، هەمانە، هەتانە، هەیەتی، هەیانە».

هەمیسان بۆ حازر دەگوترێ «هەیەتم، هەیەتمان، هەیەتت، هەیەتتان، هەیەتی، هەیەتیان». لێرەدا وەک ئەو سیغەیەی لێ کرا کە دەڵێ «کردوەتم، کردوەتمان، کردوەتت، کردوەتتان» کە بە واتای «کردوومە، کردوومانە...» دێ لە زاری خەڵقی سولێمانی. دەشدیترێ بۆ کەسی سێیەمی تاک بۆ هەر دوو وێنە هەر سیغەی «هەیەتی» بەکار دێ.

لە مازیدا دەگوترێ «هەمبوو، هەمانبوو، هەتبوو، هەتانبوو، هەیبوو، هەیانبوو» لە موزارعدا دەگوترێ «دەمبێ، دەمانبێ، دەتبێ، دەتانبێ دەیبێ، دەیانبێ».

ئاشکرایە بەکارهێنانی «هەبوون» بە واتای «تملک» دەیکاتە کاری تێپەڕ «متعدی»، بە پێچەوانەی ئەوە کە بە واتای «مەوجوودم» بەکار بێ ئەو فیعلی لەگەڵیدا دێ دەبێتە تێنەپەڕ، وەک گوتمان.

تۆ کە دەڵێی «من هەم، من هەبووم، من دەبم» بە واتای مەوجوودم، مەوجوود بووم، مەوجوود دەبم، وەک ئەوەیە کە گوتبێتت «من نووستووم، من نووستم، من دەنووم» کە تەسرِیفی کارێکی تێنەپەڕە.

بەڵام کە دەڵێی «هەمە، هەمانە» سیغەی «گوتومە، گوتومانە» ت بەکارهێناوە کە هی کاری تێپەڕە. لە کاری تێنەپەڕدا ناگوترێ «نوستوومە،

نوستوومانە...». کە دەشڵێی «هەیەتم، هەیەتمان» سیغەی «گوتوەتم، گوتوەتمان» ت بەکارهێناوە کە ئەویش هی تێپەڕە.

لە مازیدا کە دەڵێی «هەمبوو، هەمانبوو» لە ڕاستە «تصریف» ت لاداوە چونکە وەک ئەوە نیە بڵێی «کردم، گوتم» بەڵام لەبەر هۆیێکی گرنگ ئەم لادانە کراوە. ئەگەر وەک «کردم و گوتم» کرابایە «ماضی» ئەوسا دەبووە «هەبووم» کە تێنەپەڕە و واتای «تملک» دانە، واتای «مەوجود بووم» دەدا. بۆیەیە کە دەڵێی «هەمبوو، هەمانبوو» ئەوەت کردوە کە لەگەڵ فیعلی تێپەڕی خاوەن پێشگری دەکەی دەڵێی «هەڵمگرت، دەرم کرد...، ئەگەر فیعلەکە تێنەپەڕ بێ دەڵێی «هەڵستام، دەرچووم».

لە موزارعیشدا کە دەڵێی «دەمبێ» موزارعی عادەتیت نەهێناوە وەک «دەخۆم، دەبینم، دەخۆین، دەبینین» چونکە ئەگەر وات کردبا دەبوا بڵێی «دەبم» کە وا بە واتای تێنەپەڕ دێ و «تملک» ی تێدا نابێ. «دەمبێ، دەمانبێ» وەک فیعلی «دەمانپەرژێ، دەمانخورێ، دەماندزێ[13] ، دەمانەوێ» وایە کە فیعلی تێپەڕن، بەڵام ڕاناوە لکاوەکەیان «مان» هەرچەند هی فیعلی تێپەڕە، لێرەدا جێگەی «مفعول» ی گرتۆتەوە.

ساغ کردنەوەی ئەو باسانە گەلێک پتری دەوێ لەوەندەی من لەسەری ڕۆیشتم، بەڵام بێگومان لە پەراوێزی گوتارێکدا هەر هێندەی جێ بۆ دەکرێتەوە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ دەبوا بە جۆرێک خۆمیان لێ بدزمەوە باسەکەش ناتەواو نەبێ و قازانجی «کورت کردنەوە» ش پێک بێ، بەڵام لەو دەربوونەی تێیرا ڕۆیشتم بۆ سەرشار و ناوەڕۆکی گوتارەکە، لووت و بزووت تووشم هات و پێم نەکرا خۆمی لەبەر لادەم تا باجی خۆی لێ سەندم.
مەبەسم لەو تێبینییە «هەمە و هەیەتم» ە نەک باسەکانی تر کە وا لە جەرگەی مەوزوعەوە هەڵدەستن. تا ئێرە کارێکی کردبێتم و گوتەیێکی گوتبێتم، بە زۆری، ڕەخنە و ڕاست کردنەوە و پێ ڕازی نەبوون بووە، لە دوو

لێوەی خامەم دەرنەچوو «ضمیر، ڕاناو، Pronoun» چیە و چەندە و چۆنە. بەڵام وەنیە لەوەدا سوچی من هەبێ، مەوزوع لە خۆیەوە پەل داوێ بە هەموو لایێکدا و گەلێک دەفتەران دەخوێنێتەوە، تەنانەت وا بووە من دەفتەرم لێ داخستووە دەنا درێژتریش خۆی لێک دەکێشایەوە.

لەو ڕوپەڕانەی وا بە دەستەوە ماون لە گوتارەکەدا دێمە سەر چەقی باسەکە و هەوڵ دەدەم، بە پێی تێفکرینی خۆم، وەرام بدەمەوە:

- لە کوردیدا ڕاناو چیە؟
- ڕاناو چەندن؟
- ڕاناو چ کارێک دەکەن؟

پێشتر گوتم لەو لیستەی حەفت لکاوییە، شەش لکیان ڕاناو نین. هەڵبەت کە دەڵێم ڕاناو نین لەو ڕووەوەیە کە وا لکی حەفتەم «ڕاناوی کەسی» کە لە ئینگلیزیدا پێی دەگوترێ «Personal»، ئەو ڕاناو بێ، چونکی هەرچی هۆی کۆکردنەوە و لەیەک چواندن و خزمایەتیی هەیە لە بەینی ڕاناوی کەسی و شەش بەشەکەی تردا نیە. لە فەرزی لە ڕێی تەعریفێکی فش و فۆڵی ڕاناووەوە بشتوانین جغزێکی پان و شل و شەپەتە بە دەوری هەمواندا بکێشین ئەو جغزە هەر وەک ئەو خەندەقەی لێ دێ کە بە دەوری ئاو و ئاگرەوە هەڵکەندرابێ. سەد جاران بڵێی «ئاو و ئاگر مادەن» دژایەتی و «تناقضی» ی میانیان بەو قسەیە هەڵناستێ. ئەگەر بە وشەسازی و فەندی ڕەوانکاریی چاری «تناقضات» کرابا دەمانگوت «داگیرکەر و داگیرکراو هەردوویان ئادەمزادن» و بەوە لە هەرا و هۆریا و شۆڕش و کشتوبڕیی دەبووینەوە. هەر تەعریفێک بێ و ڕاناوەکانی «گوتمان، دەڵێین» کۆبکاتەوە لەگەڵ وشەی وەک «ئایا، هیچ کەسێ» ئەو تەعریفە لەوەی زیاتر نەکردوە کە خۆی ئاوس کردوە بە شتی وێک نەچووی وەک «هێلکەی مراوی و خاکەناز و مووی ساختەی باڕوکا». پێشتر گوتم ئێستاش دەڵێمەوە کە زمانزان یاسا و

دەستووری وەها دانیٚ ڕاناوی «میم» لە ڕستەی «کردم» دا بەر ئەو تەعریفە بخا کە بۆ «فلاّنەکەس و فیسار» دانراوە ئیتر پێی ناویٚ «اسم، فعل، ظرف و صفه» ش لە یەکدی جودا کاتەوە. شاعیر گوتەنی «زەحمەتی بێهودە چ لازم».

من لێرەدا ڕیٚ بە خۆم نادەم، دەرفەتیش نیە، بچمە ئەو بنج و بنگە فکرییە کە بیروباوەڕی زمانزانانی لەسەر هەڵچەقیوە دەربارەی تێکڕای دەستوورەکانی ڕێزمان یا تایبەتی دەستووری سەر بە ڕاناو کە یەکێک بیٚ لە بەشەکانی ئاخاوتن. ئەم کارە نە دەکریٚ و نە پێویستە. لێرەدا هەر هێندە ماوەی قسە و تۆژینەوە هەیە کە بایی هەڵسەنگاندنی ئەو ژوورخانە ئاشکراو دیارە بکا کە لە کتێبان نووسراوە و بەسەر زار و زمانانەوەیە.

ئەو شەش بەشەی کە دەمێنێتەوە دوای دەرهاویشتنی ڕاناوی کەسی لە لیستەی حەفت کەرتی، بەلای منەوە، ئەوانیش کۆنابنەوە لە ژێر ناونیشانی «ڕاناو» یا هەر عینوانێکی تر بیٚ چونکە زۆر لەو بەشانە هێند لە یەکدی دورن ئەگەر ڕواڵەتێکی بیٚ بایاخیش خزمەتییان لە میاندا پێک بێنیٚ، جودایی وەها بەهێز لە یەکدییان دەترازێنیٚ کە نەشیٚ هەرگیز لەتەک یەکتردا دابنرێن و بە تیرە و هۆزێک حیساب بکرێن. سرنج بدە ئەو «ی» ی ڕستەی وەک «پیاوەکەی هاتە لام» و بیخە تاک وشەی «هیچ کەس» و خۆ خەریک کە بە دۆزینەوەی شەباهەت و لەیەکدی چوون لە بەینیاندا. بیٚ لە گەمە ئەم دوو وشەیە هەر ئەوەندە لە یەکدی دەچن و خزمن لەگەڵ یەکتر کە هەریەکەیان وەک ئەوی تر بریتیە لە پیتی «ئەلف و بیٚ» و لە ئاخافتندا دەورێکی هەیە، لەوە زیاتر هیچ تایبەتییێکی «مشترک» کۆیان ناکاتەوە. وەک ئەم دوو وشەیەش وشەی «هی» لە ڕستەی «جلکەکە هی دارایە» و وشەی «یەکێک» لە ڕستەی «یەکێک هات بۆ ماڵەکەمان» ئەوانیش هێندی هەموو جووتە وشەییێکی لەیەکتر بێگانە بێگانەن. وشەی «هی» واتاییێکی ڕوتی «تملک» دەبەخشیٚ وەک وشەی «of» لە ئینگلیزیدا، هەر ئەوەندە فەرقەش

هەست پێ دەکرێ لە بەینیاندا کە جۆری بەکارهێنانیان لە دوو زمانەکەدا لە یەکتریان جودا دەکاتەوە. وشەی «یەکێک» بە لەفز و واتاوە تەواو سەربەخۆیە.

خولاسەی قسە ئەوەیە کە وشەکانی «من، ئێمە، ئێوە، تۆ، ئەوان، ئەو» بە خۆیان و شێوە لکاوەکانیانەوە ڕاناو بن ڕێگە دەبەسترێ بە تەواوی لەوە ئەم عینوانە بۆ هیچ بەشێکی تری ئاخاوتن بەکار بێ.

بەڵام تۆ بڵێی کە ناوی ڕاناوت نەکردە عینوانی ئەم تاقمە وشەیە ئایا عینوانی ڕاناو دەست دەدا بۆ شەش کەرتەکەی تر؟ بێ ئەوە بچمە ناو درێژە پێدان و خورد کردنەوە، بەلای باوەڕی منەوە، ئەم چەند تێبینیانەی خوارەوە بەقەدەر «بدیهیە» دێنە بەر هەست و سرنجی مرۆڤ دەربارەی کۆمەڵە وشەی لیستەی شەش لکاوییەوە:

1- عینوانی «ڕاناو» دەست نادا، نە بۆ تێکڕای لیستەکە نە بۆ هیچ یەکێک لە لکەکانی.
2- ئیمکان نیە هیچ عینوانێکی تر ئەم کۆمەڵە وشەیەی لە یەکتر نەچووی پەڕاگەندەی بێ سنوور و پەراوێز بخاتە ژێر سایەی خۆیەوە.
3- گەلێک لە وشەکانی یەکێک لە لکەکان بۆ خۆیان ناچنە ژێر تاکە یەک عینوانەوە و دەبێ دابەش بکرێن بەسەر چەند بەشێکی ئاخافتندا.

من لێرەدا ماڵئاوایی یەکجارەکی دەکەم لەم شەش لکەی لیستەی ڕاناوان و چ ڕووپێوی تری ئەم گوتارەیان پێ ناگرمەوە، مەگەر ناوناوە موناسەبەیێکی ناچاری بیانهێنێتەوە ناو باسەکە، چی ماوە لە مەودای نووسین لە قەبەڵ ئەو تاقمە وشەیەی دەکەم کە لە لیستەکەدا «ڕاناوی کەسی» بۆ بەکار هاتووە.

**ڕاناوی کەسی؟**

وەک لێتەوە دیارە، بەر لەوەی بچمە ناو لێکۆڵینەوە و ڕوون کردنەوە، عینوانی «ڕاناوی کەسی» بەلای قەناعەتی منەوە پرسەک «علامة سؤال» ێکی گەورەی بەسەرەوەیە، واتە هەر لە پێشەوە بەم عینوانە ڕازی نیم خۆ بکاتە ڕوانگەی تێوەڕامان لەم کۆمەڵە وشەیە. عینوان و ناو و نیشان کە دادەنرێ بۆ هەر باسێک وای لێ چاوەڕوان دەکرێ چەند مەبەستێکی بنجی جێبەجێ کردبێ وەک:

1- ڕێ نەدا بە هاتنە ناو غەیری باسی ئەسڵی بۆ ناو جغزی عینوانەکە، کەچی وشەکەی «کەسی» کوێرە ڕێیانیش نابەستێتەوە لە ڕووی وشەی وەک «کێ» کە ڕاستەوخۆ و بێ کینایە و تەئویل لە هەموو کەسان کەسترە و بێ سێ و دوو قوت دەبێتەوە لەسەر چەقی واتای «ڕاناوی کەسی». لە وشەی «کێ» ش واز بێنە سەیرێکی وشەی «ئەمە» بکە. لەبەر تیشکی واتای «ڕاناوی کەسی» دا چ فەرقێک هەیە لە میانی «ئەمە دارایە - ئەو دارایە؟»، بە ڕاستی کوردی گوتەنی، درۆزن نەبێ فەرقیان پێ ناکا.

نەخیر، زاراوەی «ڕاناوی کەسی» شورەیێکی هێندە بڵند ڕاناکێشێ بە دەوری مەبەستدا کە نەهێڵێ وشەی بێگانە بەسەریدا بازدا بۆ ناویەوە.

2- هەموو کەرت و بەشەکانی باسەکە بگرێتەوە بەهۆی واتای عینوانەکە خۆیەوە نەک لە ڕێی تەئویل و یارمەتی دانەوە. کە ئەمە بکەین بە کێش و تەرازووی هەڵسەنگاندنی زاراوەی «ڕاناوی کەسی» دەبینین زاراوەکە لە زۆر ڕووەوە کورت دێنێ. پێشتر گوتم وشەکانی «من، ئێمە» بە هیچ جۆرێک ناچنە جێی ناو، ئیمکانیش نیە ناو جێیان بگرێتەوە، کەواتە زاراوەی «ڕاناو» بۆ ئەمان دەست نادا چونکە بەر واتای ڕاناو ناکەون. دو وشەی «تۆ، ئێوە» ش لەو ڕووەوە وەک «من، ئێمە» وان. بە ڕاستی وشەکانی «ئێمە، من — ئێوە،

تۆ» ڕاناو نین بەڵام «کەس» ی تەواون. کە سرنج بدەین دەبینین وشەکانی «ئەو، ئەوان» دەشێ پێیان بگوترێ «ڕاناو» چونکە جێی ناویان گرتۆتەوە، بەڵام وەنیە هەموو جاران دەلالەتی «کەس» یان هەبێ وەک بڵێی «من مێشولەکەم نەکوشت، ئەو لە خۆوە مرد». بەو پێیە مەعلووم دەکرێ کە «من، ئێمە، تۆ، ئێوە» کەسن و ڕاناو نین، «ئەو، ئەوان» ڕاناون و هەموو جاران کەس نین.

3- بەرچاوترین و بنجیترین سروشت و تایبەتی باسەکە دیار بخا. لەم لایەنەوە زاراوەی «راناوی کەسی» سەرەڕای بە سەهوو بردن، هەر دەڵێی بۆیە هاتووە تایبەتیەکانی ئەم کۆمەڵە وشەیە تێببا و ڕواڵەتێکی درۆزن لە جێگەیان دانێ. لە فەرزی زاراوەی «ڕاناوی کەسی» دەستیش بدا، کە هیچ دەست نادا، دیسانەوە بە نیسبەت ڕاگەیاندنی سروشت و کاری وشەکانەوە کەم و زۆر نەیپێکاوە، بە تایبەتی بە نیسبەت «ڕاناوی لکاو» ەوە کە بەشێکە کەسی و هەر ناتەواوییێک لە عینوانەکە هەبوو بە نیسبەت ئەوەوە دەبێتە ناتەواوی لە هەموو مەوزوع. با بزانین لە گۆشەی نیگای ڕاناوی لکاوەوە چۆن زاراوەکە هەر بەجارێ دەست نادا.

پێی ناوێ دووبارە کەمەوە لە خۆوە دیارە، ئەوەی لە زاراوەکە بۆ جۆری نەلکاوی دەست نەدا، بۆ جۆری لکاویشی دەست نادا، چونکە لکاو و نەلکاو هەر یەک شتن، ئەمەش «بدیهیە» یەو دەمەتەقە هەڵناگرێ. کەواتە جۆری لکاویشی نە هەمووی ڕاناوە و نە مەرجە هەموو جارانیش بۆ کەس بێ. دەمێنیتەوە زاراوەی «لکاو» ئایا ئەو چۆنە؟

ئەم وشەیەی «لکاو» ە هەر لەوەدا ڕاست دەکا کە لە نووسیندا دەلکێ بە وشەی پێش خۆیەوە، لەوە بەولاوە، وەک کڵاوی سەخرەجنی، هەموو سروشت و کار و تایبەتییێکی ڕاناوە لکاوەکان دەشارێتەوە. کە لێت بپرسن ئادەمزاد چیە؟ و بڵێی گیانلەبەرێکە بە پێیان دەڕوا ڕاست ئەوەیە گوتبێتت ڕاناوی لکاو

ئەوەیە دەلکێ بە وشەی پێش خۆیەوە. نەختێک ورد بینەوە لێمان مەعلووم دەبێ هەر ئادەمزاد بە پێیان نارِوا، چەندین گیانلەبەری تریش وەک ئەو بە پێیان دەرِۆن. گرنگترین رِەوشت و سروشتی ئادەمزادیش ئەوە نیە کە بە پێیان دەرِوا، نەخێر پێیەکانیشی ببرِیتەوە جارێ هەر ئادەمزادە.

رِاناوی لکاویش تەنها کەرتێکی ئاخاوتن نیە کە دەلکێ بە وشەوە، چەندین ئەمرِاز هەیە وەک ئەو دەلکێن و لە نووسیندا دەبنە پارچەی یەک وشە وەک کە دەڵێی «کچی باش، سێیەم، هۆشمەند، فرۆشیار، بەختەوەر...». لکان و نەلکانی وشە لە نووسیندا دەگەرِێتەوە بۆ جۆری دەستوورەکانی رِێنووس، لەوانەیە برِیار بدرێ هەندێک لەو لکاوانە نەلکێنرێن یاخود لکان هەر بە جارێ یاساغ بکرێ. ئاشکرایە زاراوەی «لکاو» وەرگێرِانی «متصل» ی عەرەبییە بۆ سەر کوردی، سەیریش لەوەدایە پەیرِەوانی زمانەوانی ئەوروپا کە دەیانەوێ لە عەرەبی دوور کەونەوە ئەم زاراوەیان هێناوە و دو جاران تێیدا بە سەهو چوون، جارێکیان لەوەدا کە نابێ زمانزانی کورد لاسایی زمانێکی تر بکاتەوە لە دانانی رِێزمانی کوردی، جارێکیشیان لەوەدا کەوا بە رِێکەوت ئەم وشەی «لکاو» ە چەندی بڵێی مێشک غەڵەتێنە لەو «تصوراتە» ی دروستی دەکا دەربارەی رِاناوی لکاو و هەرچی رەوشت و کردار و تایبەتییێکی هەیە دەیخاتە ژێر پەردەوە.

رِەنگە وا چاک بێ لێرەدا پێشدەستی بکەم و ئەو کردار و سروشتەی رِاناوی لکاو باس بکەم بەر لەوەی بچمە سەر دیارخستن و ژماردنی رِاناو و بەشەکان و جۆرەکانی. بە درێژایی نووسینەکەشم دەبێ ئەوەت لە بیر بێ کە من جارێ هەر رِاناوی لکاو بە کار دێنم، نە بە زاراوەی رِاناو و نە بە هی لکاو رِازیم، وتوویژ دەربارەی دۆزینەوەی زاراوەییێکی رِاست و دروست بۆ ئەم تاقمە وشەیە کارێکی لێرە بە دواوەیە، کارێکی ئاسایش نیە یا جارێ خۆم و خوێنەری پێوە خەریک نەکەم.

ڕاناوی لکاو سەرەڕای ئەوەی کە پێکهێنەری ڕستەی تەواوی خاوەن «حکم و اسناد» ە لە کوردیدا تایبەتییێکی سەربەخۆی ئەوتۆشی هەیە کەم و زۆر لە تیرە و هۆزی «ناو، ئاوەڵناو» تەنانەت ڕاناوی لکاویش دەرناکەوێ، بە کورتی تایبەتی ئەوتۆیە لە خودی ڕاناوە نەلکاوەدا هەیە و هیچی تر. بە وردی سرنج بگری دەبینی چالاکییێک لەو ڕاناوانەدا هەیە لە دەستەی کۆمەڵەی ناو و نەلکاو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکاریان دەردەبا و دەیانگەیەنێ بەو پایەیە کە دەبوا فیعل نەبێ نەیگاتێ، لەو ڕووەوە کە فیعل بۆ خۆی ڕودانە و چالاکییێکی روتە. با مەبەستت بۆ ڕوون کەمەوە بە میسال، دەڵێی:

تێفکریم، تێوەڕامام، لێدوام.

ئەمڕاز «یاخود پێشگر» ەکانی وەک «تێ، تێوە، لێ» هاتنە پێش «فعل» ەکان و لەگەڵیاندا بەکار هاتن. ئەم پێشگرانە وەک خۆیان دەمێننەوە کە فیعلەکان دەبنە چاوگ «مصدر» چونکە چاوگیش وەک فیعل ڕودانی تێدایە و دەگوترێ: تێفکرین، تێوەڕامان، لێدوان. ئینجا با بەرکار «مفعول» ێک بێنینەوە و بیخەینە ڕستەوە لەگەڵ ئەو فیعلانە. دەڵێی: لە دارا فکریم، لە تۆوە ڕامام، لە برزو دوام. دیتت پێشگرەکان کە کۆبوونەوە لەگەڵ «ناو، ڕاناوی نەلکاو» گۆڕان و بوونە «لە».

ئینجا با ڕاناوی لکاو بێنین لەگەڵ فیعلەکان، دەڵێین:

تێیان فکریم، تێوەم ڕامان، لێت دوام.

دیتت پێشگرەکان کە دەکەونە پێش ڕاناوی لکاوەوە وەک ئەوەن کە کەوتبنە پێش فیعلەوە، واتە ڕاناوە لکاوەکان ڕەفتاری فیعل دەکەن نەک ناو و ڕاناوی نەلکاو. لەو میسالانەدا ڕاناوە نەلکاوەکان هەموویان لە جێگەی «مفعول» بەکار هاتن، بەڵام وەک فاعیلیش بەکار بێن فەرقێک ناکەن لە ڕەفتاریان کە ڕەفتاری فیعلە، دەڵێی:

لێم دان، تێمان گرت، تێت ڕاخوڕین.

چەند میسالێکی تر لەگەڵ بەکارهێنانی ئەمڕازی «بە» دێنینەوە. دەڵێی: پێ هەڵگەڕا، پێ کرا، قسەکەی پێ گوت. لە چاوگیشدا هەر دەگوترێ پێ هەڵگەڕان، پێ کردن، پێ گوتن.

ئەم ئەمڕازەش کە لەگەڵ ناو و هاوڕێکانی هات ئەوە نامێنێ کە لەگەڵ فیعل و چاوگ بوو. دەگوترێ: بە شاخەکە هەڵگەڕا، چراکە بە ئاگر کرا، قسەکەی بە دارا گوت. بەڵام لەگەڵ ڕاناوی لکاودا ئەو ڕەفتارە دەکا کە لەگەڵ فیعلدا کردی: پێی هەڵگەڕام، پێتان کرد، هەرچی هەبوو پێم گوت.

ئەمە ڕەفتارێکە لە ڕاناوی لکاو بەولاوە هەرچی بەشی ئاخاوتن هەیە نایکا، بۆشی ناکرێ، هەر هەمان چالاکی و بزۆزی و کاریگەرییە وا دەکا ڕاناوی لکاو ئەو جێگۆڕکێیە بکا کە لەم میسالانەدا دەردەکەوێ:

دەڵێی «دەمگوت». کە نەفیت کرد دەڵێی «نەمدەگوت». ئینجا پێشگر یا ئەمڕازێکی بخە پێش و بڵێ «پێم نەدەگوت». دەبینی ڕاناوە لکاوەکەی «م» هێندە ئامادەیە بۆ کارتێکردن، کام کەرت لە پێشی فیعلەکەوە بێ دەرلەحزە پێوەی دەلکێ و کاری خۆی لێ دەکا، ڕاناوەستێ لەسەر هاتنی کەرتێکی تر.

جارێکی تریش لەوە بفکرە کە لە کوردیدا «مضاف الیە» بەهۆی «ی» پەیوەندی یا «اضافی» بە دەوری خۆی هەڵدەستێ. دەڵێی «سەری شاخەکە بەرزە، ناوی تۆ دارایە، خانووی فلانەکەس دوورە...». بەڵام کە ڕاناوی لکاو بوو بە «مضاف الیە» هەر بۆ خۆی دەبێتە پێک هێنەری «ترکیب اضافی» بێ ئەوە پێویست هەبێ «ی» ی پەیوەندی بێتە ناو ڕستەوە. دەڵێی: براتان ڕۆیشت، خانوەکەمان فرۆشرا، چاوت شینە، ڕێیان دورە.

بگەڕێی بە دوا میسالاندا لە زمانەکەت، گەلێک جۆری بەکارهێنانی ڕاناوی لکاو دەدۆزیەوە ئەم تایبەتیەی زێدە چالاکی و بزۆزی و کارکردنەی تێدا دیار کەویێ. من بۆ خۆم لەو زمانانەی شتێکیان لێ دەزانم یەکێکم نەدیت ڕاناوی لکاوی یاخود بەشێکی تر لە بەشەکانی ئاخاوتنی ئەو کردارە بکا کە ڕاناوی لکاو لە زمانی کوردیدا دەیکا.

بە ڕاستی ڕاناوی لکاو داینەمۆی زمانی کوردییە، بە تایبەتی لە لەهجەی کوردستانی خوارووداِ، حەیفە زمانزان هەر بەقەدەر ئاوەڵناو و پیتی پەیوەندی و ئیشارە و پرسیار بایەخی پێ بدا یاخود لەسەری زمانیەوە بیکا بە سێبەری ناو. باوەڕم هەیە هەر کەسێک بە ڕونی و ئاشکرای و قوڵی لە ڕاناوی لکاوی کوردی نەگا، لە کونهی زمانی کوردی ناگا. لێرە بە دواوە دەبینی زوربەی کەسەکان ڕاناوی لکاوی جۆراوجۆریان هەیە، هەر یەکەیان کارێک دەبینن و بە فەرمانێک هەڵدەستن لە «ماضی» یەوە بۆ «مضارع» و لە تێپەڕەوە بۆ تێنەپەڕ و لە ڕستەی بێ فیعلەوە بۆ ڕستەی فیعلدار. ئەوەندی فیعل لە «تصریف» دا شکڵی دەگۆڕێ و کات گۆڕی دەکا ڕاناوی لکاویش لە لەهجەی کوردی خوارووداِ شکڵ و کرداری خۆی دەگۆڕێ، جێ گۆڕکێش دەکا.

ئەوەندەی بۆم باس کردی لە زێدە چالاکیی ڕاناوی لکاو و پێکهاتنی ڕستەی تەواو و بە «اسناد» بەهۆی ئەوەوە بەسە بۆ دەرخستنی گرنگی ڕۆڵی ئەم بەشەی ئاخافتنە لە زمانی کوردیدا. هەر لە ڕێی ئەم گرنگییەی ڕۆڵییەوە دەریش دەکەوێ ڕاناو هەڵناگرێ ناو و عینوانێکی زیهن غەڵەتێنی بۆ دانرێ کە تایبەتیەکانی بشارێتەوە یاخود بیکا بە خزمەتکاری بەشێکی تری زمان کە «ناو» ە. سەیرە وشەی وەک «ئەدی، ئەرێ، پەکو، دەک، وەی...» ناونیشانی سەربەخۆیان هەبێ وەک خوازرایەوە وابێ.

من، جارێ پێشنیازێکم نیه بۆ گۆڕینی زاراوەی «ڕاناو». وا بە چاک دەزانم ئەرکی دۆزینەوەی زاراوەییێکی لێ هاتوو بۆ ئەم بەشەی ئاخافتن یا بخرێته سەرشانی دەستەییێک لە زمانزانان، یاخود کۆڕی زانیاری کورد بە بەرخۆی هەڵبرێ. بەڵام بە نیسبەت زاراوەی «لکاو» ەوە ئەو هەموو خۆگرتنە و قایمکارییە بە پێویست نازانم. دەست نەدانی زاراوەی «لکاو» گەیشتۆتە ڕادەی تاوانباری، لەوە تێپەڕیوە کە هەر ناقوڵاو نالەبار بێ. بەلای منەوە «نەلکاو و لکاو» هەردوویان دوشمنی ڕێزمانی کوردین، لەناو بردنیان نەک مافی هەمومانە و بەس، فەرمانێکی دڵسۆزی و پەرۆشە بۆ زمانەکەمان وا بەسەر شانمانەوە. من لە ڕێی سروشت و ڕەفتاری جۆری «لکاو» ەوە بۆ ئەوە دەچم زاراوەی «چالاک» ی بۆ بەکار بێ، خۆ ئەگەر وشەییێکی بەهێزتر و بزۆزترمان بە دەست کەوێ باشتریشە، چونکە لکاوەکان بۆ چالاکی و بزۆزی وشەی نموونەیین. هەر لە ڕێی «چالاک» یشەوە فکرم بۆ وشەی «مەند» دەڕوا کە بکرێ بە زاراوە بۆ «نەلکاو».

لە پاشماوەی گوتارەکەمدا دوو زاراوەی «مەند و چالاک» بەکار دێنم لە جیاتی «نەلکاو و لکاو» و دەڵێم «ڕاناوی مەند و ڕاناوی چالاک».

ئەو وشانەی لە لەهجەکانی کوردیدا بۆ ڕاناوی مەند دێنە بەر گوێ، ناڵێم دێنە بەرچاو چونکی زۆریان لە نووسیندا بەکارنایێن تا چاو بیانبینێ، بە درێژی لە کۆبوونەوەییێکی لیژنەی ڕێزمانی سەر بە کۆڕی زانیاری کوردەوە لێیان کۆڵرایەوە و بە «استقراء» ی تایبەتی ئەندامانی لیژنە کۆکرانەوە و ئەم لیستەیان لێ پێک هات:

- بۆ کەسی یەکەم:
  1- تاک: من، ئەز، ئەمن، م.
  2- کۆ: ئێمە، ئەمە، ئەم، مە.
- بۆ کەسی دوەم:

1- تاک: تۆ، ئەتۆ، ئەتو، تو، تە.
2- کۆ: ئێوە، ئەنگۆ، ئەوە، هەوە، هوین، هنگ، وە.

- بۆ کەسی سێیەم:
1- تاک: ئەو، ئەوێ، وێ، وی، ئەوی.
2- کۆ: ئەوان، وان، ئانا، ئەو، وا.

دەزانم بەشێکی وشەکانی ئەم لیستەیە بەر گوێی خوێنەری کورد نەکەوتوە، واتە هەموو کوردێک هەموو وشەکانی نەبیستوە، بەڵام گومانم نیە وشەی تریش هەن کە بەر گوێی ئەندامانی لیژنەی ڕێزمان نەکەوتوون یا بە بیریاندا نەهاتوون. لێرەدا نە مەبەستمە، نە ڕێشم هەیە ڕەسەنی و بیژۆکی هەر یەک لەم وشانە ساغ کەمەوە، لیستەکە وەک خۆی دەهێڵمەوە بۆ سرنج و تێفکرین، سەریش لە کەس ناشێوێنێ لە نووسیندا هەروەک لە خۆشمی نەشێواندوە. ڕچەی خامەی نووسەران بەر پێی هەندێک لەو وشانەی وا هەموار کردوە کە هەر ئەوان بێنە سەر کاغەز و بگەنە بەرچاوی خەڵق.

ئەمانە کە سەرجوملەی وشەکانی «ڕاناوی مەند» بن لە شکڵی «چالاک» دا لیستەییێکی تر دروست دەکەن، بەڵام وەک بۆت دەردەکەوێ ئەمیان وەک هی «مەند» بێ دەمەتەقە نیە. ئەوەی ڕاستی بێ خەریکبوون بە گەیشتنی کۆتایی دەمەتەقەکە تا ئەو ڕادەی ئیسپاتێکی بێگومان بەرهەم بێنێ و گۆشەی نیگای خاوەنەکەی بسەپێنێ بە بەڵگەی ڕێزمانی و «منطقی» و مێژوویی، مەیدانێکی گەلێک بەر فرەوانتری دەوێ لەم گوتارە. چارم ناچارە دەبێ خۆم لە زۆر تەفسیلات و وردەکاری و نهێنبینی بدزمەوە تا نووسینەکەم لە قەوارەی گوتاردا جێی ببێتەوە. زەڕڕەبینی و قووڵبوونەوەی ئەو پەڕەکی دوابخرێ بۆ تۆژینەوەی لەسەرەخۆتر و بەر فرەوانتر.

بەڵام وا بە باش دەزانم بەر لەوەی یەخەگیری «ڕاناوی چالاک» بین چەند قسەیێک هەیە لەگەڵ ئەو بەشەی پێی گوترا «ڕاناویی خۆیی» یەک لای بکەین و جێگەی ڕاست و دروست بۆ ئەم «ڕاناو» ە دەست نیشان بکەین. لە پێشەوەش بەڵێنم دا کە دواتر سەرێکی لێ خوار بکەینەوە، با ئێرە جێگەی پێک هێنانی بەڵێنەکە بێ.

سەرجوملەی وشەی ئەو «ڕاناوە» بەقەدەر ژمارەی «ڕاناوی چالاک» دەبێ کە بۆ «اضافة» بەکار بێ. ڕاناوەکان، بەو پێیە، ئەمانەن:

- کەسی یەکەم: خۆم، خۆمان.
- کەسی دوەم: خۆت، خۆتان.
- کەسی سێیەم: خۆی، خۆیان.

لە هەندێ لەهجەی کوردیدا لە جێگەی «خۆمان» تەرکیبی «خۆن» بەکار دێ، لە جێگەی خۆتان «خۆو». من ناچمە ناو درێژەی جیاوازیی لەهجەکانی کوردی چونکە بە پێویستی نازانم و بابەتی باس لێ کردنیش نیە. هەر دەمەتەقەیێک هەبێ لەگەڵ ئەم کۆمەڵەی سەرەوەدا دەیکەم.

ئەم وشانە، زیاد لە پێنج بەشەکەی لیستەی ڕاناوان وەک ڕاناوی «هەیی و پرسیاری و ئیشاریی... هتاد» هەڵدەگرن لە ڕستەدا شوێنی وشەکانی «ڕاناوی مەند» بگرنەوە، دەگوترێ «من خۆم هاتم، ئێمە خۆمان هاتین، ئێوە خۆتان هاتن، تۆ خۆت هاتی» دەشتوانی ڕاناوە مەندەکان نەڵێی و ڕستەکەش وەک هەیە وا بمێنێتەوە و بڵێی: «خۆم هاتم، خۆمان هاتین، خۆتان هاتن». ئەم ڕواڵەتە زیهن بۆ ئەوە دەبا کە وشەکان وەک بەشی «مەند» ئەوانیش ڕاناو بن چونکە لە ڕستەدا جێگەی ئەو بەشەیان بە تەواوی گرتۆتەوە و ڕاناوی «چالاک» دەبێتە تەواوکەریان.

بەڵام نەختێک وردبوونەوەی زمانزانانە ڕاستییێکی تر دەردەخا و جێگە و ناونیشانی ڕاستەقینە بۆ ئەم کۆمەڵە وشەیە دەستنیشان دەکا.

دەزانین ئەم وشانە پێک هاتوون لە ئیزافەی «خۆ» بۆ ڕاناوەکانی چالاک. بێگومان تاکە وشەی «خۆ» ش لە فەرهەنگدا واتاییێکی بۆ دیار دەکرێ و کراوە چونکە وەک هەموو وشەییێکی فەرهەنگی لە ئاخاوتندا بەکار دێ و دەگوترێ: خۆماڵی، خۆیی، خۆییاتی، خۆهەڵدانەوە، خۆڕەپێش کردن، خۆکرد...هتاد هەر بەو پێیە خۆم، خۆمان، خۆتان، خۆت، خۆی، خۆیان بێ زیاد و کەم تەرکیبێکی ئیزافییە وەک هەر تەرکیبێکی تر لە زمانی کوردیدا لەگەڵ تێبینی ئەوە کە واتای «خۆ» تەرکیبە ئیزافییەکە ئامادە دەکا بۆ ئەو بەکارهێنانە کە واتاکە لێی دەوەشێتەوە. بە میسال دەڵێم لە کوردیدا ناگوترێ منم دیت، ئێمەم دیت، ئێمەمان دیت، تۆت دیت، ئێوەت دیت، ئێوەتان دیت. کەچی دەگوترێ خۆم دیت، خۆتانتان دیت. کە ئەمە وایە هەڵبەت ئیسپاتی هێندێ نەکرد «من، ئێمە، تۆ، ئێوە، ئەوان» ڕاناو نین بەڵکو بە پێچەوانە، ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەم ڕاناوانە بۆ دەربڕینی واتای جۆرجۆر پێویستییان هەیە بە وشەی جۆرجۆر کە واتاکان بە دەستەوە بدەن. تۆ سەیرکە دەتوانی بڵێی «دەستمم گوشی» بەڵام وا خۆشە بڵێی «دەستی خۆم بڕی» هەرچەند لە ڕووی ڕێزمانەوە چ مانیعێک لەوەدا نییە کە بڵێی «دەستمم بڕی». تۆ دەتوانی بڵێی «ئەوی دیت، ئەوانی دیت» بەڵام ئەوسا کەسێکی سێیەمی تری دیوە نەک «خۆی و خۆیان». ئەمانە پێداویستی «تعبیر» دەیانهێنێ بۆ ناو ئاخاوتن نە سیفەتی ڕاناوی لە «من و تۆ و ئەو» دەسەنێتەوە نە ئەم سیفەتەش بۆ وشەی «خۆ» دەسەپێنێ، کە ورد بیە دەبینی میسالەکان «خۆ» دەکەنەوە بە وشەییێکی فەرهەنگی خاوەن واتاییێکی تایبەتی.

«خۆ» دەوەستێتە بەرامبەر «نفس، عین، Self» لە ڕوی واتاوە، وا دەبێ جێگەی لە ڕستەدا هەر ئەو واتایانە دەبەخشێ واش دەبێ جێگەی «تأکید»

دەگرێتەوە. دەڵێی «خۆکوشتن» کە واتاکەی «قتل الذات» ە دەشڵێی «من خۆم هاتم» کە دەبێتە «جئت بنفسی، بذاتی» بۆ تەئکیدە. لە ئینگلیزیشدا دەگوترێ «Self sacrification» کە واتاکەی خۆبەخت کردنە دەشگوترێ «I mayself» کە ڕاستەوخۆ «من خۆم» ڕادەگەیەنێ کە تەئکیدێکی ڕوتە.

هەر ئەو ڕاگەیاندنەی واتای «تأکید» ە ڕێ دەدا بگوترێ «خۆم هاتم» و ڕاناوی چالاک «م» ببێتە تەواوکەری ڕستەکە بە دوا وشەی «خۆ» دا. دیققەت بگرە دەتوانی بڵێی «هەمووومان هاتین» کە لەویشدا ڕاناوی چالاکی «ین» بە دوا وشەی «هەموو» دا هاتووە. کە دەڵێی «خۆمان هاتین» وشەی «خۆ» سەرلەبەری «ئێمە» دەگرێتەوە، هەروەها کە دەشڵێی «هەمووومان هاتین» وشەی «هەموو» دیسانەوە سەرلەبەری «ئێمە» دەگرێتەوە، لە هەردوو حاڵیشدا، سەرەڕای گرتنەوەی سەرلەبەری واتای ئێمە، تەئکیدیش هەیە. بۆیەیە دەشێ ڕاناوی چالاکی «ئێمە» کە وا لەم ڕستانەدا «ین» ە بە دوا «هەموو، خۆ» دا بێت. تۆ سەیرکە کە لە ڕستەدا وشەی «نیوەمان، هەندێکمان...» کەوتە جێگەی «هەمووومان» ئەوسا بە دوو جۆر دەتوانی ڕستەکە تەواوکەی:

- نیوەمان هاتین.
- نیوەمان هات.

لێرەدا واتای، «ئێمە» بەڵام نەک سەرلەبەری «ئێمە»، دەتوانی وشەی «نیوە» بکەیتە «بدل ناقص» ی ڕاناوی «ئێمە» و ڕاناوە چالاکەکەی «ین» ی بدەیتێ و «بڵێی نیوەمان هاتین» دەشتوانی وشەی «نیوە» بەکار بێنی وەک کەسی سێیەم، چاکتریش ئەوەیە بە گوێرەی ڕواڵەتی وشەکە کە ڕواڵەتێکی «تاکە» فیعلی تاکی بۆ بێنیەوە و بڵێی «نیوەمان هات نەک نیوەمان هاتین» چونکە کە وشەی «نیوە» لە ڕستەکەدا خۆی لە واتای

«ئێمه» و کۆبونەوەکەی ترازاند وا پەسەندترە بە جارێک لێی بترازێی، واتە هەم لە ڕووی کەسی یەکەمەوە و هەم لە ڕووی کۆ «جمع» ەوە.

لە بیرت نەچێ هەرگیز بۆت ناکرێ بڵێی «هەمووومان هات» چونکە واتای هەموو سەرلەبەری ئێمە دەگرێتەوە و دەبێ وەک ئەو کار بکا.

دیت سروشتی «هەموو» هەڵی گرت ببێتە «نیوە، هەندێک، کەمێک...» بەڵام سروشتی «خۆ» ئەم کەرت کردنە هەڵناگرێ کە ئەمە چ دەخلێکی نیە بەسەر ڕێزمانەوە.

بۆیەیە زمانزان نابێ خۆی تەسلیم بە ڕواڵەتی وشە و پێداویستی سروشت و واتای بکا لە ڕستەدا. چ سوچی زمان نیە کە ناگوترێ «هەمووم هاتم» چونکە واقیع ئەمەیە کەسی تاک نیوە و سێیەکی نیە تاکو وشەی «هەموو» بێ و دەفعی شوبهەی هاتنی نیوە و سێیەکی بکا. وشەی «هەموو» هەر هەمان وشەیە کە دەدرێتە پاڵ «ئێمە» و دەگوترێ «هەمووومان» و کە ناشدرێتە پاڵ «من و تۆ» و ناگوترێ «هەمووم هاتم، هەمووت هاتی». وشەی «خۆ» ش هەر هەمان وشەی فەرهەنگییە لە تەرکیبی «خۆکوشتن» و «خۆیان هاتن، خۆمان هاتین» دا. تۆ سەیرکە وشەکانی «خۆ، هەموو، هەندێک» ڕاناوی چالاکیان بە دوادا نایێ ئەگەر ئیزافەی ڕاناو نەکرابن، بە تایبەتی بە نیسبەت «خۆ» وە. تۆ هەرگیز ناتوانی بڵێی «خۆ هات، خۆ هاتم، خۆ هاتین» تەنانەت ئەگەر ڕاناوی مەندیش لە پێشەوە بێ هەر ناگوترێ «من خۆ هاتم، ئێمە خۆ هاتین، ئێوە خۆ هاتن». بە نیسبەت «هەموو» ەوە کە دەگوترێ «هەموو هاتین» ئەوەی ڕاستی بێ ڕاناوەکەی قرتاوە دەنا ئەسڵی ڕستەکە «هەمووومان هاتین» بوە. هەڵبەت تایبەتییێک لە وشەی «هەموو» دا وای کردوە ڕێ بدرێ بە قرتانی ڕاناوەکە، تایبەتییێکی وشەی «خۆ» ش وای کردوە ڕێ نەدرێ بە قرتانی ڕاناوەکە، بەڵام ئێرە جێی ئەم درێژە پێدانەی تێدا نابێتەوە با وازی لێ بێنین.

خولاسه وشەی «خۆ» واتاییێکی فەرهەنگی هەیە و لە سنووری ئەو واتایەدا بەکار دێت، ئیزافەی بۆ ڕاناوەکانی «چالاک» وا دەکا لە تەواوکردنی واتای ڕستەدا ڕاناوی چالاکی بە دوادا بێت و بگوترێ «خۆم هاتم، خۆم سەرکردەم» دەنا کە ئەو ئیزافەیەی نەبێ وەک وشەییێکی عادەتی لێ بەسەردێ بێ زیاد و کەم وەک بڵێی «خۆ هەڵدانەوە باش نیە» کە ئەمە لەلایەن دەستووری ڕێزمانی و واتای فەرهەنگییەوە چ فەرقێکی نیە لەگەڵ ئەوەدا کە بڵێی «دەست هەڵبڕین پێویستە لە کاتی دەنگ وەرگرتندا».
سەیرێکی ئەم ڕستە نموونەییانە بکە:

- کابرا خۆیی دەرچوو – کابرا کۆیی دەرچوو.
- بەرخەکە خۆماڵییە - بەرخەکە ئاوەکییە.
- خۆی بوو بە فێرکار – برای بوو بە فێرکار.

چەندی ئارەزوو بکەین دەتوانین ڕستە بێنینەوە و وشەی «خۆ» تێیاندا وەک هەر وشەییێکی تری فەرهەنگی کوردی بەکار هاتبێ و ئەو واتایەی بە دەستەوە دابێ کە بە پێی جێگەی لە ڕستەدا و لە گوێرەی سروشت و تایبەتی خۆی لێی چاوەڕوان دەکرێ.

ئینجا با بێینە سەر و کاری ڕاناوی «چالاک».

قسەی من لێرەدا بە زۆری لەگەڵ لەهجەی کوردی ناوچەی کوردستانی ژێرووە، ئەو لەهجەیە بووە بە ئەمڕازی نووسین و کەرستەی تەعبیری ئەدەبی و بڵاوکردنەوەی کتێب و ڕۆژنامە و گوتار و نامیلکە. دەورەدان لە هەموو لەهجەکانی کوردی کات و ماوەییێکی زۆری دەوێ، خۆم و خوێنەریش لە ئەرک و پێوە خەریکبوونی دەبەخشم.

جارێ با لە پێشەوە ئەو ڕاناوە چالاکانە بخەمە سەر کاغەز کە بەلای هەموو زمانزانەکانەوە ڕاناوی چالاکن، لەگەڵ تێبینی ئەوەدا کە هەر من پێیان دەڵێم

«چالاک»، لەلایەن زوربەی نووسەرانەوە «ڕاناوی لکاو» یان بۆ بەکار دێ، ناشزانم ئاخۆ لە دوارۆژدا شتێکی تریان پێ دەڵێن یاخود پێ دادەگرن لەسەر هەمان ناونیشانی «ڕاناوی لکاو» بۆیان.

جۆری چالاکی ڕاناوی «من» لە هەموو حاڵاندا هەر پیتی «م» ە، پێی ناوێ میسالی بۆ بێنمەوە چونکە «استثناء» لە دەستوورەکەدا نیە و چ شکڵێکی تر پەیدا نابێ بۆ ئەم ڕاناوە.

ڕاناوی چالاکی «ئێمە» دوو جۆری هەیە «مان، ین».

کەسی دوەمی تاک «ت، ی» جۆرەکانی چالاکیەتی، بەڵام بەلای تاقمێک زمانزانانەوە لە جیاتی «ی» «یت» راناوە و دەڵێن دەبێ ئەو «تێ» یە بە دوا «یێ» یەکەدا هەر بێت و نەقرتێ وەک «تۆ بەر لە من هاتیت، دوای من دەڕۆیت». من خۆم لەوانەم هەمیشە دەڵێم و بە زۆری دەنووسم «تۆ بەر لە من هاتی، دوای من دەڕۆی». دواتر قسە لەم باسە یەک لا دەکەین.

بۆ کەسی دوەمی کۆ ڕاناوی چالاک «تان، ن» ە.

بۆ کەسی سییەمی تاک ڕاناوی چالاکی بێ دەمەتەقەی هەر «ی» ە کە لە «ماضی» بە دوا فیعلی تێپەڕدا دێ و دەشبێتە «مضاف الیه» وەک «چی پێی کرا کردی، خۆی و برای هاتن».

بۆ کەسی سێیەمی کۆ «یان، ن» ڕاناوی چالاکن.

بەر لەوە بگوێزمەوە بۆ ڕاناوە چالاکەکانی گوماناوی دەبێ ئەوە بڵێم ئەم ڕاناوانەش لەبەکارهێناندا بێ گرفت نین، ڕوون کردنەوەی چۆنەتی هاتنیان بۆ ناو ڕستە داستانێکە سەربەخۆ، دەمەوێ لێرەدا بە کورتریین شێوە لێی ببمەوە.

ڕاناوی چالاکی فیعلی تێپەڕی ڕابردوو، هی هەموو کەسەکان، خۆیان دەبنەوە «مضاف الیە»، وەک:

- کردمان، برامان.
- کردت، برات.
- کردتان، براتان.
- کردی، برای.
- کردیان، برایان.

میسالم بۆ کەسی یەکەمی تاک نەهێنایەوە چونکە لە هیچ حاڵێکدا ناگۆڕێ. لە «مضارع» دا بۆ تێپەڕ و تێنەپەڕ ڕاناوە چالاکەکان یەک جۆریان هەیە، وەک:

- دەخۆین، دەڕۆین.
- دەخۆی، دەڕۆی.
- ئێوە دەخۆن، ئێوە دەڕۆن.
- ئەوان دەخۆن، ئەوان دەڕۆن.

ڕاناوی فیعلی «ماضی» تێنەپەڕیش هەر ئەو ڕاناوەی فیعلی «مضارع» ە بۆ هەموو کەسەکان:

- ڕۆیشتین، دەڕۆین.
- ڕۆیشتی، دەڕۆی.
- ئێوە ڕۆیشتن، ئێوە دەڕۆن.
- ئەوان ڕۆیشتن، ئەوان دەڕۆن.

هەر ئەو ڕاناوانەی «مضارع» و فیعلی تێنەپەڕیشە کە لە ڕستەی بێ فیعلدا دەبێتە هۆی پەیدا کردنی «حکم و اسناد»:

- ئێمە کوردین.
- تۆ کوردی.
- ئێوە کوردن.
- ئەوان کوردن.

هەموو زمانزانان لەوەدا یەک باوەڕیان هەیە کە کەسی سێیەمی تاک لە «ماضی» تێنەپەڕدا ڕاناوی نیە، بۆیەیە ڕاناوێکی مەعلووم کراوی بێ دەمەتەقەی نیە، وەک کەسەکانی تر، ڕستەی تەواوی بێ فیعلی بۆ پێک بێنێ، هەر ئەم هۆیەیشە وای کردوە زمانزانان ڕێک نەکەون لەسەر یەک باوەڕ دەربارەی ئەمڕازی «حکم، اسناد» لە ڕستەی بێ فیعلی وەک «ئەو کوردە»، ئایا ئەم بزوێنەی کۆتایی ڕستە «ە» ڕاناوە یاخود شتێکی تر؟ لە جێی خۆیدا قسە لەم باسە دەکەم.

تێکەڵ پێکەڵییەکی یەکجار سەرشێوێن هەیە لەبەکارهێنانی ڕاناوە چالاکەکان لە «صیغە» جۆرجۆرەکانی فیعلی تێپەڕدا، ئەوەندەی سەرم هێناو برد نەمتوانی شێوازێکی نووسینی ئەوتۆ بەکار بێنم گیروگرفتەکان باوێتە ناو پەراوێزێکەوە لەگەڵ پەراوێزی گوتار خزمایەتی هەبێ، بە ناچاری ئەم باسە زۆر گرنگ و گرێیاویەم واز لێ هێنا، کە وام نەکردبا دەبوا پشکێکی گەورەی بارستی گۆڤارەکەم بۆ گوتارەکەی خۆم دابڕیبا کە ئەمەش کارێکی ناڕەوایە. لێرەدا تاکە میسالێک دێنمەوە زەحمەتی تەقەللای یەک لا کردنی گرفتەکان بێنێتە بەرچاو.

شاعیرێکی کورد لە سەرەتای شیعرێکی ئەمەی گوتوە:
«کوشتمت ئاخر بە ناحەق»

هەڵبەت ئەمە گوتەیێکی کوردی رەسەنی بێ هەڵەیە و دەشێ بۆ دارِشتنی ڕستەی تر ببێتە نموونە. دەبینی «مفعول» بە دوای «فعل» ی «کوشتن»

دا هاتوه کە ڕاناوی چالاکی کەسی یەکەمە، واتە پیتی «م» ە. بە شوێن «مفعول» دا ڕاستەوخۆ «فاعل» هاتوە کە ڕاناوی چالاکی کەسی دوەمی تاکە واتە پیتی «ت» ە. بەو پێیە دەبێ کە بمەوێ کەسی یەکەم بکەم بە فاعیل و کەسی دوەم بکەم بە مەفعول جێگەیان بەیەکتر بگۆڕمەوە و بڵێم «کوشتتم» واتە من تۆم کوشت. کەچی لە هەندێ لەهجەی کوردی ڕێکوپێکدا دەگوترێ «کوشتمی» کە ئەمە لە هەمان کاتدا واتای «ئەو منی کوشت» یش دەگەیەنێ.

لە پژدەر دەگوترێ «کوشتنم» واتە من ئێوە یا ئەوانم کوشت، کەچی لە شوێنی تردا بۆ هەمان واتا دەگوترێ «کوشتمن». لە هەندێ ناوچەدا دەڵێن «کوشتیانم یاخود کوشتمیان». وا هەیە دەگوترێ «کوشتینی» بە واتای ئەو ئێمەی کوشت، کەچی دەشگوترێ کوشتمانی.

لە صیغەی ئاوات «تمنی» دەتوانی بڵێی «بمکوشتبای، بمکوشتبان» واتە من تۆ، ئێوەم بکوشتبا، لە هەمان کاتدا دەشتوانی بڵێی «کوشتبامی، کوشتبامن». ڕستەی «کوشتبامی» ئەو واتایەش دەبەخشێ «ئەو منی کوشتبا».

تا بە دوای میسالان بکەوین بابەتی تازە بە تازەی گیروگرفت دێتە بەرچاو. هۆی ئەم تێک ئاڵقان و تێک ئاڵۆزانە بەلای منەوە شتێکی نهێنی نیە، بەڵام باس لێ کردن و هەڵوەشاندنی گرێ پچکەکانی، سەرەڕای زەحمەت، کاری تاکە کەسێکیش نیە. گریمان من توانیم هەموو جۆری هەڵەی بەکارهێنانی ئەم ڕاناوانە بدۆزمەوە، جۆرە ڕاستەکانیش دەست نیشان بکەم، تۆ بڵێی مافی ئەوەم هەبێ داوا لە نووسەران و زمانزانانی کورد بکەم بێنە سەر ئەو ڕێیە کە من بە ڕاستی دەزانم؟ دەبێ ئەم باسەش واز لێبێنم وەک وازم هێنا لە موناقەشەی پێنج بەش لە حەفت بەشی لیستەی ڕاناوەکان بە خۆیان و «مفردات» یانەوە. وا دەزانم بڕیاری ڕاستی و هەڵەیی بەکارهێنانی ڕاناوە

چالاکەکان مافی کۆڕی زانیاری کوردە، با بۆ ئەو یا لایەنێکی تری دەسەڵاتی بەجێبهێڵین.

ئینجا با بێنیە سەر باسی ئەو ڕاناوە چالاکانە کە دەمەتەقەیان بەسەرەوە هەیە. لە پێشەوە قسە لە ڕاناوەکانی کەسی دوەم دەکەین ئینجا کەسی سێیەم، هەردوکیشیان هی تاک.

گوتمان لە کاری ڕابردوی تێپەڕدا «فعل ماض متعد» ڕاناوی کەسی دوەمی تاک پیتی «ت» ە وەک کە دەگوترێ «خواردت، دیتت، کێڵات، بیستت، درووت». بە پێی دەستوورێکی گشتی ڕێزمانیش هەر هەمان ڕاناوە دەبێتەوە «مضاف الیە - حەز دەکەم زاراوەی ««خاوەن»» بەکار بێ بۆ مضاف الیە»، دەگوترێ «برات، خزمت، بەرگت، ناوت، ڕێت، کەللەت...»، دەشچێتە پاش ئەمرازانەوە وەک «لێت دەپرسم، پێت دەڵێم».

بەڵام ڕاناوی چالاکی کەسی دوەمی تاک لە کاری ڕابردووی تێنەپەڕ و کاری «مضارع» ی تێپەڕ و تێنەپەڕ و ڕستەی بێ «فعل» ی تەواو، ئا لەم سێ حاڵەتەدا دەمەتەقەی لەسەرە. تاقمێک لە زمانزانان دەڵێن ڕاناوەکە دوو پیتی «یت» ە و ناشێ پیتی «ت» ەکە لە ڕستەدا بقرتێ و دەبێ هەمیشە وەک لەو میسالانەدا دەردەکەوێ، بەکار بێ:

- تۆ ڕۆیشتیت – ڕابردوی تێنەپەڕ.
- تۆ دەڕۆیت – «مضارع» ی تێنەپەڕ.
- تۆ دەکەیت – «مضارع» ی تێپەڕ.
- تۆ پاکیت – ڕستەی بێکار «فعل» ی تەواو.

هەروەها لە صیغەیێکی «فەرمان، داواکردن، أمر، طلب» کە یەکێکە لە دوو «صیغە» ی «فەرمان، أمر» لە کوردیدا دەبێ ئەم ڕاناوە «یت» بێ نەک

«ی»:
دەبێ نان بخۆیت ئینجا بخەویت.

صیغەی «فەرمان، أمر» لە جۆرەکەی تردا «بکە، بخۆ، بخەوە» یە بێ زیاد کردنی «یت».

بەلای هەندێک لە زمانزانانەوە، کە منیش لە باوەڕی ئەواندام، ئەوەی ڕاناو بێ لەو ڕستانەدا هەر پیتی «ی» ە، پیتی «ت» کە بە دوا «یێیە»کەدا دێ زیادەییێکی «صرفی، گەردانی»یە دەشێ بمێنێ و دەشێ لەناو بچێ. وەنیە من لە زەرفێکدا بم بتوانم بڵێم لە مێژووی کۆنەوە ئەم «ت» ە هەروا بێ بایەخ بووە، یاخود بزانم لە ئەسڵدا چۆن و بۆ چ مەبەستێک هاتوە، بەڵام ئەوەی بە ڕاناویشی دادەنێ لەم لایەنانە بێ خەبەرە وەک من، بەڵگەی بە ڕاناو حیساب کردنی هەر ئەوەندەیە کە بە دوا «یێیە»کەدا دێ و دەشێ «تلفظ» بکرێ.

لە باوەڕی مندا ڕاناوی چالاک، لەبەر زێدە گرنگی ئەو دەورەی پێی هەڵدەستێ لە ئاخافتندا، ناشێ هیچ پیتێکی بقرتێ. لە پێش چاومانە ڕاناوە چالاکەکانی «مان، تان، یان» لە هەموو حاڵێک و لە هەموو لەهجاندا کە بەکاریان دێنن وەک خۆیان دێنەوە و هیچ پیتێکیان لێ کەم ناکرێتەوە، «تێیە»کەی «دەکەیت» یش ئەگەر پیتێکی بنجی با دەبوا ئەویش وا با. لەمەش زیاتر دەتوانم بڵێم: بۆ دەبێ ڕێ هەبێ «ێیە»کە بقرتێ و بگوترێ «دەکەی» کەچی ڕێی قرتانی «یێیەکە» نەبێ، خۆ زۆر ئاشکرایشە دەنگی «ی» لە کوردیدا بە ئاسانی لەناو دەچێ! ئەگەر یێیەکە بنجی نەبا دەبوا ئەو ببێتە قوربانی «تێیە»کە و بگوترێ «دەکەت لە جێگەی دەکەی». هەر هەمان دەنگی «ت» لە ڕابردووی تێپەڕدا بەهۆی ئەوەوە کە ڕاناوە هەرگیز تێچوونی بۆ نیە.

که بگەڕێینەوە بۆ بویژانی بابان لە سەدەی نۆزدەمدا دەبینین تێکڕایان بە زۆری ئەم تێیەیان قرتاندوە. کوردی دەڵێ:

خۆت بۆ ستەمان کەم بووی بیستت قسەی ئەغیاریش

فیرعەونی زەمان ئامان گوێ مەگرە لە هامانت
گوتی «کەم بووی» نەیگوت «کەم بوویت»

نالی دەڵێ:

تۆ کە حۆری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سۆزانمدا.

گوتی «تۆ کە حۆری» نەیگوت «حوریت». گوتی «چ دەکەی» نەیگوت «چ دەکەیت».

لزوم نیە نموونە لە شیعری شاعیرانی ناوچەکانی تری کوردستان بێنینەوە چونکە بەکارهێنانی ئەم «تێیە» ی دوای «ییێە»کە زیاتر لە سلێمانی باوە.

بگەڕێینەوە بۆ فارسیش، کە لەگەڵ کوردیدا خزمایەتی هەیە، دەبینین لەوێدا بۆ کەسی دوەمی تاک لە «ی» بەولاوە ڕاناوی چالاک بەکار نایێ، واتە دەنگی «ت» هەر بە جارێ بزرە لە هەموو ئەو ڕستانەدا کە «حکم و اسناد» یان تێدایە. تەنها بۆ «اضافة» لە فارسیدا «ت» دەبێتە ڕاناوی چالاکی کەسی دوەم.

دەگوترێ:

- تو رفتی، تو گفتی، تو اورا دیدی.
- تو می روی، تو می گوئی، تو اورا می بینی.

هەر دەڵێی فارسی ئەم ڕاناوەی «اضافة» ی لە کوردی خواستۆتەوە چونکە لە کوردیدا بەکارهێنانی ڕاناوی «ت» بە پێی دەستووری گشتی ڕێزمان بۆ «اضافة» و فیعلی تێپەڕی ڕابردوو دەبێ و دەگوترێ:

- کردت، بردت، خواردت، هێنات.
- دەستت، خانووت، برات، خانەت.

کەچی لە فارسیدا چ دەستووری گشتی نایێتە بەرچاو کە ئەم «ت» ەی هێنابێتە ناو ڕستەوە، یا دەبێ بڵێین تایبەتییێکی زمانی فارسییە یا زیهن بۆ ئەوە دەڕوا لە زمانی کوردی خواستبێتەوە.

وەنیە لەوەدا چ زیانێک هەبێ ئەم «ت» ە بە بەشێکی ڕاناوەکە حیساب بکرێ، هەروەها زیانیش نیە بگوترێ زیادەییێکی «صرفی» یە، ڕاستی هەر لاییێکیان بێ زمانی کوردی زەرەری لی ناکەوێ بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دو تێبینی دێنە بەر هۆشی مرۆڤ:

- یەکەم: ڕاستی، کە سوودێکی تایبەتیشی نەبێ، چاکترە لە هەڵە، با هەڵەکەش چ زیانێکی لێ نەکرێ.
- دوەم: ڕەوا نابینم ئەو کەسانەی «ت» ەکە بە بەشێکی ڕاناو دادەنێن داوا بکەن لە خەڵق هەمیشە لە نووسیندا تێیەکە بنووسن.

سەپاندنی ئەم تێیە بەسەر نووسیندا دو زەرەری گەورەی تێدایە:

- یەکەم: بەشێکی یەکجار زۆری کەلەپووری ئەدەبیمان کە تێیەکەی بەکارنەهێناوە ڕاستەوخۆ مۆری هەڵەی لێ دەدرێ.

- دووەم: ڕێبازێکی گوشاد لە ڕەوتی ئەدەبیمان کوێر دەبێتەوە و ئازادیی تەعبیرمان کەم دەبێتەوە، بە تایبەتی بە نیسبەت شاعیرەوە کەوا دەبێ کێش و قافیەی شیعری بەند دەبێ بە تێبردنی ئەو تێیە.

سەیری ئرم بەیتەی نالی بکە هەرچەند بۆ کەسی سێیەمیشە:

نالی زمانەکەی تەڕ و پاراوی سووسنت
حەیرانی چاوی نەرگسە وەک لالە نادوێ

کە مەجبوورت کردبا بڵێ «نادوێت» کۆتێکت دەخستە دەستی و شیعرەکەت لێ یاساغ دەکرد، ئەوسا یەکێکی تریش ڕێی دەبوو لە لای خۆیەوە مەنعی ئەم نیوە دێڕەش بکا لە هەمان قەسیدەد:یا شاهی نەوبەهارە هەڵی داوە هوردوێ.

چونکە وشەی «هوردوێ» پیتێکی «ک» ی لێ قرتاوە ئەسڵەکەی «هوردێک» بوە.

خاوەنانی ئەو باوەڕەی کە دەڵێ «ت» ەکە زیادەییێکی «تصریفی» یە چ ڕێیان کوێر ناکەنەوە، هێشتنەوە و قرتاندنی «تێیە»کە دەخەنە بەر زەوق و خواهشتی بێژەر.

کەواتە بەکارهێنانی ڕاناوی چالاکی کەسی دووەمی تاک «ضمیر متصل للمفرد المخاطب» لە لەهجەی کوردستانی خواروودا گردەبڕ دەبێتە دو جۆری لەیەکدی جودا:

جۆری یەکەم بەلای هەموو زمانزانەوە تاکە پیتی «ت» ە ئەویش لەم شوێنانەدا بەکار دێ:

1- ڕابردوی تێپەڕ لە هەموو کاتەکانی و هەموو صیغەکانی خەبەری و ئینشائیدا.

نموونە بۆ صیغەکانی خەبەریی:

- کردت، کردوتە، کردبوت، دەتکرد.

نموونە بۆ صیغەکانی ئینشائی:

- کردبات، کردبێتت، کردبووبات، بتکردبا «بتکردایە لە لەهجەی سلێمانیدا»[13].

2- دەبێتە «مضاف الیە - خاوەن» بێ یارمەتی «ی» ی ئیزافە، دەڵێی: «برات هات، ناوت دارایە، دەستەکانت درێژن».

«لێوت کە وەکو لەعلی بەدەخشانە بە ئاڵی».

3- وەک فیعل و چاوگ دەکەوێتە دوای ئەو ئەمڕازانەی سەر بە فیعلن. دەگوترێ «لیتەوە دیارە، پێت خۆشە، تێترِا دەبینم» کە چاوگەکانی «لێوە دیاربوون، پێ خۆشبوون، تێ ڕادیتن» ە. ئەم ئەمڕازانە هەرگیز نایێنە دوای ناو وەیا ئاوەڵناوی مەندەوە. دەگوترێ «لە ئەخۆلەوە دیارە، بە تۆ خۆشە یاخود تۆ پێت خۆشە، لە تۆ ڕادەبینم».

دەشبێتە هاوبەشی ناو و ڕاناوی مەند لە ئەمڕازی «بۆ» دا، کە هەرگیز فیعلی بە دوادا نایێ. دەگوترێ «بۆت بە پەرۆشم، بۆ تۆ بە پەرۆشم، بۆ دارا بە پەرۆشم».

4- لە ڕستەی فیعلیدا دەبێتە «فاعل و مفعول» و بە پێی داوای دەستووری دروست کردنی ڕستەی فیعلی لە کوردیدا جێگۆڕکێ دەکا، دەگوترێ:

- چیت کرد – لێرەدا فیعلە.
- دەتبینم – لێرەدا مەفعولە.

نموونەی جێگۆڕکێ:

- دەتگرت، نەتدەگرت، هەڵت نەدەگرت، منداڵەکەت هەڵ نەدەگرت.
- لە ئێمەت پرسیبا، لێت پرسیبااین، لێمانت پرسیبا، پرسیبات.

هەڵبەت ڕاناوی چالاکی کەسی دووەمی تاک لەم تایبەتیانەدا هەر خۆی وانیە، هەرچی ڕاناوی چالاک هەیە وایە. ئەمە دەربارەی جۆری یەکەمی ڕاناوەکە کە پیتی «ت» بوو.

جۆری دووەمی ئەم ڕاناوە چالاکە چ بڵێین تاکە پیتی «ی» ە و چ بڵێین دوو پیتی «یت» ە ئەویش مەیدانی تایبەتی خۆی هەیە بۆ بەکارهێنان لە ئاخاوتندا:

1- لەگەڵ فیعلی ڕابردووی تێنەپەڕدا دێ: تۆ هەڵستای – هەڵستایت، تۆ نووستی – نووستیت، تۆ چووی – چوویت.

2- لەگەڵ فیعلی «مضارع» دا دێ تێپەڕ بێ و تێنەپەڕ بێ: دەکێڵی، دەکەی، دەخۆی، دەنوی، دەکەوی، دەمری، دەبرژێی یاخود دەکێڵێت، دەخۆیت، دەکەویت...

3- لەگەڵ یەکێک لە دو صیغەی فەرمان «أمر» دا دێ: بکەی، بخۆی، بنوی، بی، بدەی، بڵێی، بکەوی یاخود بکەیت، بنویت، بڵێیت....

ئەوەی ڕاستی بێ صیغەی فەرمانی ڕاستەقینە هەر «بکە، بخۆ، بنوو، بکەوە» یە نەهی ڕاستەقینەش «مەکە، مەخۆ، مەنوو، مەکەوە» یە، هەر بۆ کەسی دوەمیش بەکار دێ کە وا لە بنەڕەتا «أمر و نهی» بۆ ئەو داهاتوە.
صیغەکەی تر بە «مثبت و منفی» یەوە واتە «بکەی، بکەن، بکەم، بکەین، بکا، بکەن – هەروەها نەکەی، نەکەن، نەکەم، نەکەین، نەکا، نەکەن» فەرمان و نەهی ڕەبەق نین، وا دەبێ بۆ «دعاء» یاخود هەڕەشە و مەبەستی تریش بەکار دێن:

- خوا نەکا تۆ نەخۆش بی.
- خوا بکا بباریێ.
- بچێ بۆ فێرگە باشترە لە بازاڕ.
- پارەکەم بدەیێ و نەدەیێ دەغڵەکەت هەر بۆ دێنم.
- «تەماعی گەورەیی بێ چەک نەکەن نەک».

4- دەبێتە تەواوکەری ڕستەی بێ فیعل، واتە لە ڕێی ئەوەوە «حکم، اسناد» لە ڕستەی بێ فیعلدا پەیدا دەبێ، وەک:

- تۆ مرۆڤی، تۆ مرۆڤیت.
- هەمیشە لە پێشەوەی، لە پێشەوەیت.
- دوشمنی کەس نی، نیت.

لە صیغەی فەرمانی ڕاستەقینەدا «مەکە، مەڕۆ» ئەم ڕاناوە بەدەر ناکەوێ، لە کەسیشم نەبیستوە گوتبێتی لێرەدا ڕاناو هەیە، تەنها مامۆستا نوری علی أمین بەلایەوە لەو فەرمانانەدا کە کۆتاییان بزوێنی «ە» یە بزوێنەکە ڕاناوە وەک «بکە، ببە، بدە، بوەستە»، کەچی هەر خۆی دەڵێ هەمان بزوێن لە ڕستەی وەک «دارا کوردە» دا ڕاناو نیە و کاری بوون «فعل الکینونە» یە.

ئەوەی ڕاستی بێ بەلای منەوە نەک هەر ڕاناو وجودی نیە لە فیعلی ئەمریی کەسی دووەمی تاکدا، هۆیەکی زۆر بەهێزیش هەیە بۆ نەبوونی ڕاناو هەم لەو فیعلە و هەم لە زوربەی فیعلەکانی کەسی سێیەمی تاکدا. لێرە بە پێشەوە بەڵێنم دا کە ئەگەر مەودای شیکردنەوەی ئەم هۆیە بمێنێ لە گوتارەکەمدا، بە پێی باوەڕی خۆم شەرحی باسەکە بکەم. بە داخەوە هەرچی دەرفەت و مەودایە بە دەستەوە نەماوە لەبەر زێدە درێژەکێشانی باسەکان، بۆیێ بە ناچاری وازی لێ دەهێنم.

ئێستا دێینە سەر باسی ئەو ڕاناوانەی کەسی سێیەمی تاک کەوا دەمەتەقەیان بە دەورەوە هەیە و زمانزانان تێیاندا گوماناوین. بە ڕاستی هەر لە دو نوقتەدا زمانزانان ڕیک دەڕۆن لە باوەڕیان دەربارەی ئەم ڕاناوانەی کەسی سێیەمی تاک.

نوقتەی یەکەم ئەوەیە کە فیعلی ڕابردوی تێنەپەڕ «ماض لازم» بۆ کەسی سێیەمی تاک ڕاناوی نیە.

نوقتەی دوەم ئەوەیە لە فیعلی ڕابردوی تێپەڕ بۆ کەسی سێیەمی تاک، دەنگی «ی» دەبێتە ڕاناو، وەک: کردی، دیتی، بردی، سووتاندی، هاویشتی... ئەم ڕاناوەیش چ دەورێکی ڕاناوی چالاک هەیە پێی هەڵدەستێ: دەبێتە «مضاف الیه» و بە دوا ئەمرازەکانی سەر بە فیعلەوە دێ و دەبێتە فاعیل و مەفعول و جێگۆڕکێ دەکا بەپێی داخوازیی دەستوورەکانی بەکارهێنانی ڕاناوی چالاک. لەوە بەولاوە جیاوازی بنجی هەیە لە میانی زمانزانان دەربارەی بوون و نەبوونی ڕاناوی چالاک بۆ کەسی سێیەمی تاک.

بەشی زۆری خاوەن ڕایەکان بۆ ئەم بیروباوەڕانەی خوارەوە دەچن:

1- له فیعلی «مضارع» دا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک هەمیشە هەیە و بریتییە لەو «ت» ەی کۆتایی فیعلەکان کە لە هەندێ لەهجەکاندا دەقرتێ وەک: دەچێت، دەخوات، دەنوێت، دەژیت، دەکات، دەنووسێت.

هەندێ لەم خاوەن ڕایانە وا دەزانن دەنگەکەی پێش دەنگی «ت» ئەویش هەر بەشێکی ڕاناوەکەیە.

2- لە فیعلی فەرمان «أمر» یشدا عەینی باوەڕ دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن لە فیعلەکانی «بڕوات، بنوێت، بڵێت، بژیت، بکات» دەنگی «ت» ی کۆتایی فیعلەکان ڕاناوە. باوەڕی وەهاش هەیە دەنگەکەی پێش «ت» ەکەش بە بەشێکی ڕاناو دادەنێ.

بە ڕاستی ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک ئەگەر هەبێ لە فیعلی «مضارع» دا هەر خۆیەتی سەر هەڵدەداتەوە لە فیعلی فەرمان «أمر» و وەک خۆی دێتەوە، واتە فیعلی «دەڕوات» نیشانەکەی «دە» ی لێ دەگۆڕێ و دەکرێتە «ب» و فیعلەکە دەبێتە «بڕوات». صیغەی «أمر» ی ڕاستەقینە هەر ئەوەیە کە بۆ کەسی دوەمی تاک بەکار دێ، چونکە فەرقی دیاری هەیە لەگەڵ صیغەی «مضارع» دا دەڵێی «دەخۆی»، کەچی لە «أمر» دا دەڵێی «بخۆ»... دەڵێی «دەکەی – بکە، دەچی – بچۆ، دەمری – بمرە».

3- بزوێنی کۆتایی ڕستەی وەک «دارا مەردە» بە ڕاناو دانانێن، بە لایانەوە «فعل الکینونە Verb to be ، کاری بوون» ە، تەنانەت هی وا هەیە لە ڕستەکانی «من مەردم، تۆ مەردیت، ئێمە مەردین، ئێوە مەردن» تەواوکەری ڕستەکان «م، یت، ین، ن» بە ڕاناو دادەنێ بەڵام بزوێنی «ە» لە ڕستەی «دارا مەردە» دا بە ڕاناو دانانێ و بە فیعلی حیساب دەکا.

بە نیسبەت خاڵی یەکەم و دوەمەوە کە ڕستەکانی «دەچێت، دەخوات، دەژیت...» لە ئایندەدا و ڕستەکانی «بچێت، بخوات، بژیت» لە فەرماندا

دەکا بە نموونەی بوونی ڕاناوی چالاک بۆ کەسی سێیەمی تاک، چی لێرە بە پێشەوە گوتم دەرباری «ت» ی کەسی دووەمی تاکەوە کە بە دوا «ی» ڕاناودا دێ، هەمووی دووبارە دەبێتەوە دەربارەی ئەم «ت» ەی کۆتایی فیعلەکان بۆ کەسی سێیەمی تاک. هەموو ئەو ڕەخنەی لەوێ خستمە بەرچاو لێرەش، ئۆتۆماتیکی، دێتەوە. بەڵام بە نیسبەت کەسی سێیەمی تاکەوە ڕەخنەیێکی تایبەتی بە زیادەوە هەیە پتر دەبێتە سەپێنەری ئەو ڕایەی کە دەڵێ «ت» ی فیعلەکانی «دەخۆیت، دەخوات» واتە هی کەسی دووەم و سێیەمی تاک زیادەی «تصریفی» ن نەک ڕاناو.

کەسی سێیەمی تاک لە «مضارع و أمر» دا نەک هەر دوو صیغەی «بە تێ و بێ تێ» ی هەیە، صیغەیێکی سێیەمیشی هەیە لە زۆرترین ناوچەکانی کوردستانی خواروودا بەکار دێ، هەروەها لە گەلێک شوێنی کوردستانی سەروشدا. سەیری ئەم نموونانە بکە:

1- دەڵێ، دەڕوا، دەژی

- دەڵێت، دەڕوات، دەژیت
- دەڵێتن، دەڕواتن، دەژیتن

2- بکا، بنوێ، بژی

- بکات، بنوێت، بژیت
- بکاتن، بنوێتن، بژیتن

لە هەردوو صیغەی «مضارع و أمر» دا سێ جۆر بەکارهێنان هەیە و تا ئێستاش زیندوون، چ دیاریش نیە بمرن. کە ڕێگە هەبێ بگوترێ ئەو «ت» ەی کۆتایی فیعلەکان کە دەشێ بقرتێن ئەوان ڕاناون، بۆ نەگوترێ «تن» ەکە تێکڕای ڕاناو بێ؟

بێگومان کەسانێک کە خەیاڵیان چوە بۆ ئەوە کە هەر «ت» ەکە ڕاناو بێ، ئەگەر خۆیان بە زۆری «تن» ەکەیان بەکارهێنابا بێ دوودڵی دەیانگوت ئەو ڕاناوە، بەڵام ڕیکەوت وایە لە ئاخاوتندا خۆیان هەمیشە هەر «ت» ەکە بەکار دێنن، تەنانەت لە هەندێکیانم بیستوە کە ئەم «تن» ە لە ناوچەی سلێمانیدا هەر بەکار نایێ، ئیتر کە خۆی بەکارینەهێنێ و لە شارەکەشیدا بەکارنەهاتبێ، دیارە بە درەنگەوە بایەخی پی دەدا یا هەر پێی نادا. بەڵام ڕاستییەکەی ئەمەیە کە ئەم صیغەیە لە سلێمانی و غەیری ئەویش لە سەرانسەری کوردستاندا بەکار هاتووە و بەکار دێ. لێرەدا بە نموونە شیعری دوو شاعیری کوردی سەدەی نۆزدەم دەکەین بە شایەدی قسە. شێخ رەزا لە پێنج خشتەکییێکی بەسەر غەزەلی «مصطفی» بەگی کوردییەوە ئەمەی گوتوە:

بە یادی چاوی مەستی خۆم گوتی مەیخانە «بێتن» جێت.

فیعلی «بێتن» م خستە ناو کەوانەوە تا چاوی خوێنەر باشتری بخوێنێتەوە.

لە لاپەڕە 9 ی دیوانی «مەلا وەسمان» کە خۆی خەڵقی سلێمانی بووە ئەم بەیتە دەخوێنیتەوە، لە پێشەوە بە ڕێنووسی خاوەنی دیوان ئینجا بە ڕێنووسی تازەی کوردی بەیتەکە دەنووسمەوە:

علمە کالای مغفرت پشتانی بالای ادمی
ژنگی عصیان دیرزینی توبە «دیکاتن» رفو

ئەمەش بەیتەکەیە بە ڕینووسی تازە:

عیلمە کالای مەغفیرەت پشتانی باڵای ئادەمی
ژەنگی عیسیان دەیرِزێنێ تۆبە «دەیکاتن» رفو

دیسان فیعلی «دەیکاتن» خرایە ناو کەوانەوە بۆ مەبەسی ئاشکرایی.

به پێی باوەڕی من، بوونی ئەم جۆرە «تصریف» ە زیاتر ڕاناو نەبوونی پیتی «ت» ئیسپات دەکا چونکە دیاردەدا کە وا نەک هەر پیتی «ت» بەڵکو دو پیتی سەرلەبەری «تن» بە زیادەوە دێنە ناو فیعلەوە و هەردوشیان بە جارێ، یا هەر جارە یەکێکیان دەقرتێن.

ئەو زمانزانانەی پێ دادەگرن لەسەر گوتن و نووسینی دەنگی «ت» لە کۆتایی فیعلەکاندا و دەڵێن دەبێ هەمیشە بگوترێ و بنووسرێ «دێت، دەخوات، بکات، بڵێت» سێ جاران، هەر جارە بە جۆرێک، ستەم دەکەن.

جاری یەکەم ستەمیان لەوەدایە کە وا بێ بەڵگە و هۆی «ترجیح»، تاکە دەنگی «ت» دەسەپێنن بەسەر گوتن و نووسیندا لە حاڵێکدا جووتە دەنگی «ت، ن» وا لە کاردان و خەڵق دەیانڵێ و دەشیاننووسێ. بێگومان سەپاندنی «ت، ن» زیاتر لە ئیحتیمالی هەڵە دووره چونکە ئەگەر دەنگی «ت» ڕاناو بێ ئەوا «ت» ەکە هەیە و نەقرتاوە و دەشێ بگوترێ «ن» ەکە زیادەییێکی «تصریفی» یە خۆ ئەگەر «ت، ن» بەیەکەوە ڕاناو بوون، ئەوە نیشان پێ کراوە و لە هەڵەی حیساب نەکردنی «ن» ەکەش بە ڕاناو ڕزگار بووین. لە فەرزی هیچیشیان ڕاناو نەبن فەرقی «ت» ی تەنها و «ت، ن» ی بە جووتە نیە، هەڵە هەر هەڵەیە.

جاری دوەم ستەمیان لەوەدایە کە بە سەپاندنی «ت» دوو شەقامەڕێی ئاوەدان کوێر دەکەنەوە، بێ لزوم و بێ بەڵگە و بێ پاڵپشتی مەنتیقی و زانستی و مێژوویی... بێ هیچ.

جاری سێیەمیان ستەمیان لەگەڵ «اجتهاد» ی خۆیانە، چونکە کە مەیلیان بۆ ئەوە چوو پیتی قرتاو بە ڕاناو حیساب بکرێ، بۆ لە نیوەی ڕێگە دەوەستن و تاکە پیتی «ت» دەکەنە ڕاناو لە حاڵێکدا زمانەکە دو پیتی بەدەستەوە داوە؟

هەندێک لەو زمانزانانە بەڵگەیێک دێننەوە کەمێک دەبێتە داروەکازی دەستی ئەم «ت» ە. دەڵێن لەو فیعلانەی صیغەی «دووبارە کردنەوە» یان هەیە ئەم دەنگەی «ت» دێتەوە و قرتانی بۆ نیە وەک بڵێی «دەرگاکە دەکاتەوە، نەختێکی تر دێتەوە، دارەکە خەریکە دەژێتەوە، تازە بەرەو ماڵ دەبێتەوە...». ئەم بەڵگەیە زەکا و وردبینی تێدایە، بەڵام مەبەست ناسەپێنێ.

سرنج بگرە دەبینی هەرچی فیعلی کەسی سێیەمی تاک هەیە لە «مضارع» دا بە بزوێن کۆتایی دێ وەک «دەڕوا، دەچێ، دێ، دەژی...»، دەوجا کە ویستت پاشگری «ەوە» ی دووبارە کردنەوەی بخەیتە سەر دەبێ پیتێکی پەیوەندی ببێتە ئاڵقەی بەیەکەوە بەستنەوەی کۆتایی فیعلەکە، کە خۆی بزوێنە، لەگەڵ پاشگری «ەوە» کە ئەویش بە بزوێن دەست پێ دەکا، مەعلوومێکی وەک بەدیهیەش وایە بزوێن ناچێتە سەر بزوێن بێ ئاڵقەی پەیوەندی. کەواتە دەبێ پیتێک بە زیادەوە بێ ئەگەر چ پیت لە بەیندا نەبوو. لەوەڕا دەردەکەوێ هاتنی «ت» یا پیتێکی تر شتێکی ناچارییە و نابێتە بەڵگەی ڕاناوبوون، تەنانەت ڕەسەنبوونیشی. بەڵام ئەو پرسیارە هەر دەمێنێ لە خۆمانی بکەین. بۆ دەنگی «ت» هات و دەنگێکی تر نەهات؟ بۆ نەمانگوت «دێخەوە» لە جیاتی «دێتەوە»؟ یاخود بۆ نەمانگوت «بەرەو ماڵ دەبێشەوە» لە جیاتی «دەبێتەوە»؟.

بەلای منەوە هاتنەوەی «ت» لێرەدا لە هاتنی هەموو دەنگێکی تری «ئەلفوبێی» کوردی لەبارتر و مناسبترە، چونکە خۆی بە ئەسڵ وەک زیادەیێکی «تصریفی» هاتنی بۆ ناو فیعلی «مضارع» شتێکی عادەتییە، واتە لە فەرزی ئیسپاتیش بوو کە ڕاناو نیە ئەوەی هەر بۆ دەمێنێتەوە کە زێدە لە دەنگەکانی تر دەشێ بێتە ناو فیعلەوە بە وێنەی «تصریفی» یاخود لە ژێر هەر عینوانێک بێ. تۆ کە ڕێت هەبێ بڵێی «دێت» با ئەو دەنگەی «ت» ە ڕاناویش نەبێ، هاتنەوەی خۆی لە کاتی پێویستیدا گونجاوترە لە هاتنی دەنگێکی تری بێگانەی وەک «ش، ک، ل، م...». لەم ڕووەوە لە ئاوەڵەکەی

خۆیشی کە «ن» ە ئاشناترە بە فیعلەکە، چونکە خۆی بە فیعلەوە دەلکێ و دەکەوێتە میانی کۆتایی فیعلەکە و نوونەکەوە، جگە لەوە کە پیتی[15] «ت» یەکێکە لەو پێنج پیتانەی دەکەونە پێش «نوونی چاوگ» و دەبنە کۆتایی فیعل. کەواتە سەیر نیە دەگوترێ «دەخواتەوە» و ناگوترێ «دەخواتنەوە» یاخود «دەخوانەوە» با ئەو «ت» ە زیادی «صرفی» بێ نەک ڕاناو.

ئەم بۆرە بەڵگەی هاتنەوەی «ت» لە «مضارع» ی دووبارە کراوی کەسی سێیەمی تاک، نابێتە داروەکاز لە هەڵستاندنەوەی باری «ت» لە «مضارع» ی کەسی دوەمی تاکدا چونکە زوربەی ناوچەکانی کوردستان لەوێدا نایهێننەوە ناو فیعل و دەڵێن «دێیەوە، دەخۆیەوە، دەکرێیەوە، دەدۆزیەوە...». لێرەدا هۆیێکی یەکجار ورد و نهێنی هەیە، بە سرنج گرتنێکی دوور و قووڵ نەبێ لە زمان و بزووتنەوەی ناوەکی میکانیزمی زمان، ئیمکان نیە هەستی پێ بکرێ. هۆیەکەش ئەمەیە:

بزوێنەکانی کۆتایی فیعلی «مضارع» ی کەسی سێیەمی تاک هەمیشە بە بزوێنی دەمێننەوە و هیچ کامێکیان ناگۆڕین بە «دەنگدار»، لەبەر ئەمە هەرگیز ناشێ بزوێنی تری پێوە بلکێ. فیعلەکانی «دەخوا، دەڵێ، دەژی، دەچێ، دەبا...» ناکەونە هیچ حاڵیکەوە شکڵی کۆتاییان بگۆڕێ بە پیتی دەنگدار. ئەم شکڵەیان «نهائی» یە. بەڵام ڕاناوی «ی» ی کەسی دوەمی تاک وا دەبێ بزوێنە و وا دەبێ دەنگدارە، واتە ئیمکان هەیە خۆی ببێتە ئەو پیتە کە بزوێنی «ەوە» ی پێوە بلکێ، ئیتر زەروورەت نامێنێ ئەو «ت» ەی زیادەی «تصریفی» بکرێ بە ئاڵقەی پێوەندی، سەیری ئەم نموونانەی خوارەوە بکە:

- دەچیت، دەژیت، دەبیت... لەمانەدا یێیەکە بزوێنە.
- دەخۆیت، دەکەیت، دەڵێیت... لەمانەدا یێیەکە دەنگدارە.

دەوجا کە حاڵ وابێ ڕێ هەیە بگوترێ «دێیەوە، دەکەیەوە، دەچیەوە، دەژیەوە، دەڵێیەوە». کە زەرورەتیش نەما بۆ هاتنی «ت» هەڵبەت خەڵق ئازاد دەبێ لەوەدا کە وەک زیادەی «تصریفی» بیهێنیتەوە یا بیقرتێنی، بەوەدا جارێکی تریش ڕاناو نەبوونی ئەم «ت» ە بەرەو ئیسپات دەچێ[16].

دیسانەوە بانگهێشتنت دەکەم لەگەڵ مندا، بە چاوێکی زەڕڕەبین، سرنج بگریە ئەم تایبەتیەی «فعل أمر» بۆ کەسی دووەمی تاک.

صیغەی «أمر» ی ڕاستەقینەی وەک «بڕۆ، بکە، بڵێ، بژی» هیچ زیادەی «تصریفی» تێدا نیە وەک لە صیغەکەی تردا هەیە کە دەگوترێ «بڕۆیت، بکەیت، بڵێیت، بژیت». لەبەر ئەمە صیغەی «أمر» ی ڕاستەقینە لەو فیعلانەدا کە دووبارە کردنەوەیان تێدایە چاوپۆشییان تێدا دەکرێ لە نەهێنانی پیتی ئاڵقەی پەیوەندی بۆ بەینی کۆتایی فیعلەکان، کە بزوێنن، لەگەڵ پاشگری «ەوە»، کە دووبارە کردنەوە ڕادەگەیەنێ. لەم حاڵەدا زەرورەت وا دەکا بێهێزترین بزوێن لەناو بچێ کە بزوێنەکەی سەرەتای «ەوە» یە واتە بزوێنی «ە» کە فەتحەی پێ دەگوترێ لە زمانی عەرەبیدا. بەو پێیە دەگوترێ «بخۆوە، بکەوە، بڵێوە». وا بزانم تەنها ناوچەی سلێمانی، کە حەز دەکا پیتی پەیوەندی بەکار بێنێ، لەم فیعلانەدا پیتی «ر» ی ناسک دەهێنێ بۆ میانی هەردوو بزوێنەکان و دەڵێ «بخۆرەوە، بکەرەوە، بڕۆرەوە...» بەڵام لەوێشدا کە کۆتایی فیعلەکە «رە» بوو واز لە «ر» ەکەی زیاد دێنن و دەڵێن «وەرەوە، بشارەوە...». ئەم حەز لێ کردنەی ناوچەی سلێمانی لە پیتی پەیوەندی، هەر خۆی سەبەبی ئەوەیە هەمیشە کات بڵێن «دەڵێتەوە، دەخۆیتەوە...» جارێکیان بە ڕێکەوتیش پیتی «ت» ەکە نەقرتێنن. وا دەبێ زیاتریش مەیلی خۆیان بۆ ئارایشتی وشەیی، کە تایبەتییێکی «حضاری» پێش کەوتووە، دیار بخەن بەوەدا کە سەرەڕای تاکە پیتی «ر» زیادەییێکی تری درێژی «تصریفی» بخەنە کۆتایی فیعلی «أمر» ەوە و بڵێن «بخۆرەوەوانێ، بێرەوەوانێ، بکەرەوەوانێ». لە ڕابردوو و «مضارع» یشدا ئەم زیادییە هەر بەکار دێنن.

ئەم ڕوون کردنەوانە دەربارەی حاڵاتی کەسی دووەمی تاک، بەر لەوە لە کەسی سێیەمی تاک بدوێم و فیعل دووبارە کردنەوە باس بکەم، جێیان خۆش نەدەبوو بۆیێ لە شوێنی خۆیانم هەڵنگاوتن بۆ ئێرە.

کەواتە باوەڕی من ئەمەیە لە فیعلەکانی «دەڕوات، دەچێت، دەخوات، دەژیت» کە فیعلی «مضارع» ی کەسی سێیەمی تاکە، نە پیتی «ت» نە پیتی پێش ئەو هیچ کامێکیان ڕاناو نین، پێداویستی «تصریف» ن. وەک ئەوانیش دو پیتی «ت، ن» لە فیعلەکانی «دەڕواتن، دەخواتن، بچێتن، بڕواتن...». ئەم زیادییانە ئەگەر ڕاناو بان دەبوا لە شوێنی تردا دەربکەون و ببنە هۆی پەیدابوونی «حکم و اسناد» لە ئاخافتندا، تۆ سەیریان کە لەو شوێنانەدا کە بەکاریش دێن «حکم واسناد» دروست ناکەن چونکە بە قرتانیان چ نوقسانییێک پەیدا نابێ، «حکم واسناد» یێک لە ڕستەدا کە هەیە هەر دەمێنێ. ئەوەی ڕاستی بێ ڕەنگە جۆرێک «تأكيد» ڕابگەیەنن، بە تایبەتی لە کاری وەک «دەبارێتن» دا ئیشارەییێکیش هەیە بۆ «مستقبل»، واتە زیاتر لە بەیانی ڕاستییێکی «مطلق»، ڕودانێکی بەرچاوی چاوەڕوان کراو دەخاتە بەر هەستی مرۆڤەوە... بەڵام ئەم تێبینییە لێکۆڵینەوەی زیاتری دەوێ.

دەربارەی خاڵی سێیەم کە بزوێنی کۆتایی ڕستەی وەک «دارا مەردە» و زمانزانان بە لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاواییەکان دەڵێن «کاری بوون، فعل الكينونه، Verb to be» یە ڕەخنەییێک و تێبینییێکی بنجیم هەیە لەگەڵ هەندێک ڕوون کردنەوە کە دەبن بە کۆتایی گوتارەکە.

وەک پێشتر باسم کرد زمانزان هەیە لە نیوان هەموو ڕاناوە چالاکەکاندا تەنها بەم بزوێنە دەڵێ «فعل الكينونه»، واتە ئەمیان زیاتر لەوانی تر قسەی بەسەرەوە هەیە کە فیعل بێ. دەبا بزانین هیچ ئیمکان هەیە ئەم بزوێنە، یاخود هاوڕێکانی کە ڕاناوە چالاکەکانن وەک «م، مان، ین، ت، ی — یت، تان، یان، ن...» فیعل بن؟ لەو ڕووەوە زووتر موناقەشەییێکی بیروباوەڕەکەم کرد

لە ڕوانگەی تێکرای ڕاناوە چالاکەکانەوە، لێرەدا کەمێک زیاتر لە موناقەشەکە قووڵ دەبینەوە بە نیسبەت ئەو بزوێنەوە چونکە تایبەتییێکی سەربەخۆ لەودا هەیە تا ڕادەیێک وتووێژ دەربارەی ئەو جودا دەکاتەوە لەوانی تر.

لە ڕستەی «دارا مەردە» دا کوا فیعل؟ دەزانین هەموو فیعلێک لە خودی خۆیدا، واتە لە ناوەڕۆک و واتای وشەکەیدا، دوو ڕەگەزی هەیە کە هەر خۆیان ناوەڕۆک و واتای فیعلەکە پێک دێنن. ئەم دوو ڕەگەزە «کات و ڕوودان» ن. هەرچی فیعلی جیهان هەیە بیانهێنەوە بە نموونەی دەمەتەقە، تاکێکیان بێ ئەم دوو ڕەگەزە نیە و ئیمکانیش نیە هەبێ. کە دەڵێی «دارا هات» بێ پێویستی تەئویل و یارمەتی دانی زمانزانانەی من و یەکێکی تر ڕاستەوخۆ ڕاتگەیاند کە ڕودانی «هاتن» لێرە بە پێشەوە بووە، «دارا» ش لابەری لە ڕستەدا و بڵێی «هات» ئەم ڕوودانە و کاتی لێرە بە پێشەوە سەرلەبەریان لە فیعلەکەوە هەڵدەقوڵن و دەبن بە ناوەڕۆکی[17] ڕودان و کاتەکە لە مێشکی من و تۆ، یاخود لە ڕاگەیاندنی واقیعێکی دەرەوەی فیعلەکە، یا لە «مقتضی الحال» و شتی ئەوتۆوە نەهاتوون، هەر خۆیان فیعلەکەن. کە دەشڵێین «ڕودان» مەبەسمان پەیدابوونی شتێکی نەبووە، واتە لە فیعلی «هاتم» دا هاتنەکە لە نوێ پەیدا بوو و پێشتر وجودی نەبوو.

لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییە بەدیهیانەدا با سەیرێکی «دارا مەردە» بکەین. با بزانین، بێ شەرم کردن لە جێگە و مەقامی زاناکانی ئەوروپا، ڕودان لە کام بەشی ڕستەکەدا هەیە؟

تۆ کە دەڵێی »دارا مەردە» حەقیقەتێکت باس کردوە، چ مەبەستت ئەوە نیە «تازە دارا بۆتە مەرد» تا خەیاڵمان بۆ «ڕودان» بچێ. لە ڕستەکەدا مەردایەتی دارا ڕوداوێکی تازە نیە کە پێشتر وجودی نەبووبێ. ئەگەر گوتبات «دارا مەرد بوو» ئەوسا مەردایەتی دارا دەبوو بە ڕووداوێک لە کاتی ڕابردوودا.

بۆ ڕوون کردنەوە فیعلێکی کەسی یەکەم دێنمەوە: دەڵێی «من مەردم». ئەم ڕستەیەش کە کردت بە «من مەرد بووم» ڕووداوێکی ڕابردووی لێ دەفامرێتەوە، واتە کە وشەی «مەرد» ت خستە بەر تاوی فیعلێکی ڕاستەقینە، واتاکەی کە «مەردایەتی» یە دەبێتە «ڕوداو».

تەماشای ئەم نموونەیەش بکە «دارا نوستوە، من نوستوم». لێتەوە دیارە بزوێنی «ە» کە من بە ڕاناوی دادەنیم و پیتی «م» کە بەلای زۆر لە زمانزانانەوە ڕاناوە لەم تەرزە صیغەیەی فیعلدا هەردوویان دەبنە هۆی بەرهەم هێنانی «ڕودان». واتە کە گوتیان «دارا نوستو، من نوستو» ڕودان پەیدا نەدەبوو هەرچەند لە ڕستەکەدا صیغەیێکی فیعلیش هەیە و ڕودانیش رەگەزێکی فیعلە.

کەواتە لە ڕستەی «مەرد بوو» دا واتای «تجرید» ی مەردایەتی بەهۆی فیعلەکەی «بوو» دەبێتە ڕودان. هەروەهاش لە ڕستەی «نوستوم، یا نوستوە» دا ڕاناوە چالاکەکان بەهۆی بوونی صیغەیێکی فیعلی «نوستن» ەوە دەبنە ڕاگەیێنی واتای «ڕودان»، هیچ کامێک لە ڕاناوەکان لە خودی خۆیاندا ڕودانیان تێدا نیە.

لەم نمایشەدا دەردەکەوێ کە فیعلی «بون» ت لە وشەی «مەرد» دوور خستەوە و ڕاناوی «م» ت لە کۆتایی فیعلڕا ڕاگوێست بۆ دوای وشەیێک کە ڕودانی تێدا نەبێ وەک وشەی «مەرد»، ئیتر ئەو ڕستەی کە پەیدا دەبێ بەداهەتەن ڕودانی تێدا نابێ، واتە کە گوتت «مەردم» گوتەیێکی بێ فیعل و بێ ڕودانت گوتوە چونکە نە وشەی «مەرد»، نە «م» هیچ کامێکیان بە خەیاڵیش روداویان تێدا بەدی ناکرێ.

بە ڕاستی ئەوەی زیهن دەغەڵەتێنێ و بەرەو هێندێ دەبا وا بزانێ لە ڕستەی «مەردم، مەردە» دا ڕوداو هەبێ، ئەو «حکم و اسناد» ەیە کە ڕاناوە

چالاکەکە ڕای دەگەیەنێ و بەوەدا بزوتنەوەییێکی واتایی پەیدا دەبێ لە ڕستەکەدا کە هەرگیز لە وشەی سارد و سڕ و بێ تاو و تین پەیدا نابێ ئەگەر هەزاریشی بە دوا یەکدیدا قەتار کەی. کە بڵێی «لێرەوە تا کەرکووک دەشت» و وەستای لە قسەکەت، چەند لاشەییێکی وشە و ئەمرازت بە دوا یەکدیدا ڕیز کردوە بێ گیان و بزووتنەوە، بەڵام کە گوتت «... تا کەرکووک دەشتە» ئا ئەم بزوێنەی کۆتایی ڕستەکە گیانیک و جموجۆڵێک دەخاتە بەر وشەکان و ڕەگەزێکی تازە دێنێتە ناوەڕۆکی ڕستەکەوە کە بریتیە لە بڕیاردانی «دەشتایی» مەودای میانی ئێرە و کەرکووک. فامرانەوەی ئەو بڕیارە لە ڕستەکەدا وا دەکا خەیاڵ بۆ واتای ڕودان بڕوا، کەچی هیچ شتێک لە نەبوویەوە پەیدا نەبووە، واتە ڕودان لە گوتەکەدا نیە، لە ڕاگەیاندنی حەقیقەت بەولاوە. ئەو بڕیار «حکم و اسناد» ە لە فیعلیشدا هەیە سەرەڕای ئەوە کە کات و ڕودانیش هەیە، واتە لە ڕستەی «نووسی» دا ڕودانی «نووسین» لە کاتی ڕابردودا دو رەگەزی رەسەنی فیعلەکەی «نووسین» ن، ئینجا بڕیارێکیش هەیە کە ڕوداوی «نووسین» لە کاتی ڕابردودا قەوماوە. بەڵام لە ڕستەی «دارا مەردە» دا لە غەیری بڕیاری هەبوونی مەردایەتی کە هێز و پێزی گوتەکەیە، نە ڕودان نە چ کاتێک مەبەستی گوتەکەیە، کە مەبەست نیە لێشی نافامرێتەوە.

ئەمە لە لایەن بوون و نەبوونی ڕودان لە ڕستەی «دارا مەردە» دا. با بزانین «کات» لەم ڕستەیەدا هەیە یاخود نیە؟

بەر لەوە لە بارەی کاتەوە تۆژینەوە بکەم دەبێ ئەوە بڵێم نەبوونی «ڕودان» تەنها بۆ خۆی بەسە ببێتە ئیسپاتی نەبوونی فیعل، واتە وشەیێک یاخود تەرکیبێک ڕودانی تێدا نەبوو دیارە فیعلی تێدا نیە، چونکە ڕەگەزی هەرە گرنگ لە فیعلدا «ڕودان» ە بە دوا ئەودا کاتە، سەرەڕای ئەوە کە بە کۆبوونەوەی هەردوو رەگەز فیعل پەیدا دەبێ. سەیری چاوگ بکە دەبینی خۆی ڕودانێکی ڕوتە و هیچی تر، کەچی لەبەر نەبوونی کات تێیدا، پێی

ناگوترێ فیعل هەرچەند کاتیش دووەم ڕەگەزی فیعلە. بەو پێیە گریمان لە ڕستەی «دارا مەردە» دا کاتیش هەبێ، فیعل هەر پەیدا نابێ چونکە ڕودان لە ڕستەکەدا وجودی نیە، لەگەڵ ئەمەشدا چ زەرەر ناکەین لە ساغ کردنەوەی بوون و نەبوونی کات لە ڕستەدا.

«دارا مەردە، ئامێدی شارێکی کوردە، ئەهریمەن ئەفسانەیە، زانکۆی سلێمانی چالاکترە لە هی بەسرە، یا هی بەسرە چالاکترە لە زانکۆی بەغدا، دەستی ڕاست لە هی چەپ بەهێزترە...» لەم ڕستانە و هەرچی وەک ئەوان هەیە، بە خەیاڵی کەسدا تێناپەڕێ دارا کەی مەرد بووە؟ شاری ئامێدی ئیمڕۆ یا دوێنێ کورد بووە؟ دەستی ڕاست لە کەیەوە بەهێزتر بووە لە دەستی چەپ؟، قسەکەر لەو گوتانەدا مەبەستی دەربڕینی ڕاستییێکە [18] بێ ئەوە ئاگای لە دوێنێ و ئیمڕۆ و سبەینێ هەبێ و بێ ئەوە ڕستەکەش خۆی لە خۆیدا چ کاتێکی دەست نیشان کراو ڕابگەیەنێ. وا دەبێ لە دەرەوەی ڕستەوە، ڕێکەوت یاخود حاڵ، کات بە ڕستەکەوە دەلکێنێ وەک: دارا لێرەیە، من تێرم، جلەکانم لای وتووچین، هەموو لەشم تەڕە. لەم ڕستانەدا دیار دەکرێ ڕاستییەکان لە کاتی ئێستادا هەن، بەڵام ئەم دیارکردنە و ڕاگەیاندنی حاڵە نەک تەرکیبی ڕستە. تۆ سەیر کە حاڵ و ڕێکەوت چ کارێک دەکەن لە ڕستەی وەک «منداڵەکە نە دەچێتە مەکتەب و نە دەبێتە شاگردیش لای دارتاش». لەم ڕستەیەدا هەردوو فیعلی «دەچێ و دەبێ» فیعلی «مضارع» ن، کەچی نەچوون و نەبوونە کە لێرە بە پێشەوە مەعلووم کراوە و ڕوداوی تێپەڕیون.

کە دەڵێی «هەنگوین شیرینە» ڕاستییێکت گوتوە لە هەموو کاتدا هەر ڕاستە، واتە لەوەتەی هەنگوین هەبووە هەر شیرن بووە، ئێستاکەش شیرینە و لە دوارۆژیشدا هەر شیرین دەبێ، خۆ کەسیش ناڵێ لەم ڕستەیەدا سێ کات بەجارێ کۆبۆتەوە.

که دەگوترێ کات لە وشە وەیا ڕستەدا هەیە مەبەست ئەوەیە لە خودی وشەکە یا تەرکیبەکە کات هەبێ نەک لە دەرەوە زەرورەت، یا ڕاگەیاندنی حاڵ، یا پێویستییێکی عەقڵی و مەنتیقی هێنابێتی. ئەگەر تەماشای تەنها واتا و ناوەڕۆکی وشە و تەرکیبی ڕستە نەکەین و گوێ راگرین بۆ دەنگ و صەدای دەرەکی داخوا کاتمان بۆ تێ دەخوێنێتەوە یا ناخوێنێتەوە، هەموو فیعلەکان تێکەڵ بە یەکدی دەبن و شیرازەی باسی زانستی زمانی لەبەر یەکدی هەڵ دەوەشێ؟، حاجی قادر دەفەرموێ:

«هەر کەسێ زا بە ناعلاجی مرد»

دو فیعلی «زا، مرد» هەردوویان ڕابردون، کەواتە ئەم قسەیە هەقی بەسەر ئەو کەسانەوە نیە لێرە بە دواوە دەبن، ئەو کەسانەش ناگرێتەوە کە وا جارێ نەمردوون چونکە نەیگوت «بە ناعلاجی دەمرێ».

دەڵێی «تێ نەکۆشیت، سەرناکەویت». فیعلەکان بۆ کەسی دوەمی تاکن و «مضارع» یشن، کەواتە کەسێکی تر بەر ئەم قسەیە ناکەوێ، ئەو کەسەی پێشتریش تێ ناکۆشابێت لەوانە بووە دەرچووبێت.

خولاسە دەلالەتی حاڵ نابێ دەخلی هەبێ بەسەر سروشت و واتای وشە و ڕستەوە. ڕێزمان خەریکی خودی وشە و دارشتن و تێکهەڵکێشانی ئاخاوتن دەبێ. کە فیعل ڕواڵەتی ڕابردو بوو هەر بە ڕابردو دەمێنێتەوە با دەلالەتیشی بۆ دوارۆژ بێ یا بە پێچەوانە.

لە ڕستەی وەک «دارا مەردە، ترێ میوەیە» دا کە وا مەبەست دەرخستنی باوەڕێک وەیا ڕاستییێکی «مطلق» ە و هیچ یەک لە بەشەکان و کەرتەکانی ڕستەکان لە خۆیانەوە پەنجە بۆ کاتێکی دیار کراو درێژ ناکەن، هەر «اعتبار» ێکی دەرەکی بێ و کات «تحدید» کا بۆ ئەم باوەڕە وەیا ڕاستییە، بایەخی پێ

نادرێ لە گۆشەی نیگای ڕێزمان و زانستی زمانەوە، کە لە عەیبی ڕستەکەدا کات پەیدا نەبوو ئیتر ئەوا کات نیە.

لە عەرەبیدا دەمەتەقە نیە لەسەر هەبوونی ڕستەی بێ فیعل، ئەو بڕیار و «حكم و اسناد»ە کە لە کوردیدا بەهۆی ڕاناوی چالاکەوە پەیدا دەبێ، لەوێدا تەرکیبی ڕستە، بە تایبەتی «تنوين الضمة»، دەیخاتە ناوەڕۆکی گوتەکە، دەڵێی «دارا رجل، العنب فاكهة» بەوەدا هەموو واتای «دارا مەردە، ترێ میوەیە» بە خۆیان و ڕاناوی چالاکیانەوە هاتنە ناوەوە چ شەڕە دەندوکیش نیە لەسەر بوونی فیعل. بەڵێ دەزانم نەبوونی فیعل لە هەندێ ڕستەی عەرەبیدا ڕاستەوخۆ ئیسپاتی شتێک ناکا لە زمانی کوردیدا بەڵام هەر نەبێ بە بیرماندا دێنێ زمان هەیە ڕستەی بێ فیعلی تێدایە، واتە نەبوونی فیعل لە ڕستەدا کارێکی «مستحيل» نیە، چ سەیر پێ هاتنیشی ناوێ «حكم و اسناد» لە زمانێکدا بە «تنوين» و لە یەکێکی تردا بە ڕاناوی چالاک پێک بێ، بێ فیعل و بێ کات.

ئێستا کە شریتەی وتووێژ و موناقەشە، دوای ئەم گەشتە دوور و درێژە، زۆر بە ئاسایی دەمانگەیەنێتە دوا ئاڵقەی زنجیرەی باسەکە: ئایا کە ئەم بزوێنەی کۆتایی ڕستەی وەک «دارا مەردە» واتە بزوێنی «ە» کە فەتحەی عەرەبیە، خۆی هۆی پێک هێنانی حوکم و ئیسنادە لە ڕستەکەدا دەبێ چ ناوێکی لێ بنرێ؟ ئایا فیعلە یاخود ڕاناوە یاخود شتێکی ترە؟

بە نیسبەت پرسیاری ئەوە کە فیعل بێ لێرە بە پێشەوە بە درێژایی نووسینەکەم گوتومە فیعلی تێدا نیە چونکە رودان و کاتی تێدا نیە. ئێستاکەش دووبارەی دەکەمەوە ئەم بزوێنە هەرچی بێ فیعل نابێ. کەسێک بشیەوێ ئیسپاتی فیعلبوونی ئەم بزوێنە بکا دەبێ بەشێکی زۆر لە ڕێزمانی کوردی بگۆڕێ تاکو دووچاری «تناقض» نەبێ لەگەڵ خۆیدا. من لێرە بە پێشەوە گوتم فیعل دوو ڕەگەزی بنجی هەیە «ڕودان و کات» و بزربوونی

یەکێک لەم دوو ڕەگەزە لە وشەدا پەکی هێندێی دەخا پێی بگوترێ فیعل، ئێستا ئەمەش ئیزافەی سەر ئەو قسانە دەکەم کە لەو تەعریفانەی بۆ «فعل» دانراوە لە کوردی، سەرەڕای کات و ڕودان مەرجێکی تریش دانراوە بۆ حیساب کردنی وشە بە فیعل. دەبێ وشەکە خۆی لە خۆیدا واتاییێکی تەواوی هەبێ نەک بەهۆی وشەی تر یا یارمەتی ڕستە و تەرکیبی ناو ئاخاوتن، واتە دەبێ فیعل لە تەنها وشەکەی خۆیدا کات و رودانی تێدا بێ وەک: هات، دەخوا، ببینە... لیژنەی ڕێزمانی کوردی سەر بە کۆڕی زانیاری کوردەوە خۆیشی ئەم «تعریف» ەی پەسەند کردوە بۆ فیعل. دەوجا کە ئەم تەعریفە بکەین بە چرا و فیعلی پێ بناسینەوە چ لزوم نامێنێ بە نیسبەت ڕاناوی چالاکەوە بە دوا کات و ڕودانیشدا بگەڕێین چونکە ئاشکرایە هیچ کامێکیان بە تەنهایی واتا بە دەستەوە نادا نە بێ زەمان و نە بە زەمان و نە بێ ڕودان و نە وەکی تر... خۆ ئەوەی ڕاستی بێ لەبەر تیشکی ئەم تەعریفەدا هێشتا دەنگی «مبهم» ی وەک «هەچە، ختە، چغە، وەشە، هەیهە، کشە...» کە بۆ «أمر و نهی» بەسەر ئاژەڵدا بەکار دێ زیاتر بەر واتای فیعل دەکەوێ تا ڕاناوی چالاک چونکە ئەم دەنگە موبهەمانە بەقەدەر «فعل أمر» کات و ڕودانیان تێدایە، خۆ دیارە وشەی ئەوتۆن دەشنوسرێن. کە گوتت «ختە» وەک ئەوەیە گوتبێتت «ئەی پشیلە لاچۆ، دوور کەوە». نیسبەتی پەیوەندی کات بە فیعلی ئەمرەوە لە چاو فیعلی ڕابردوو و «مضارع» دا داستانێکی سەربەخۆیە، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی تایبەتی هەیە کە بە هیچ شکڵێک لێرەدا جێی نابێتەوە، ئەوەندە تێبینییەشم هێنایە بەرچاو تاکو خوێنەر یا زمانزان وەک شوانی پسپۆر کە وا بە تروکەییێکی[19] شەوقی هەورە تریشقە ڕانەکە بەسەر دەکاتەوە، ئەویش لە تروسکەی ئەم تێبینییەڕا لایەنێکی مەیلەو تاریکی زمان بێنیتە ناو جغزی نیگایەوە و زیهنیشی بە دوا لایەنی تاریکی تردا بگێڕێ.

لام وایە چیتر لزوم نیە بە دوا ئیسپاتی فیعل نەبوونی بزوێنی کۆتایی ڕستەی «دارا مەردە» دا بکەوین، چونکە ئەوەندەی هێنامانە بەر چاو لە ڕووناکی و

بەڵگە و هۆی شت ناسینەوە، ئەم بزوێنەی ڕوت کردەوە لە هەموو واتا و سروشت و تایبەتی و ڕواڵەتی فیعل.

بەڵێ بێگومان «دارا مەردە» ڕستەییێکی بێ فیعلە، وەک «مبتدأ و خبر» ی زمانی عەرەبی حوکم و ئیسنادی تێدایە بەڵام نەک لە ڕێی دارِشتنێکی ڕوتەوە کە «تنوین» تێیدایە دەبێتە تەواوکەری واتا، بەڵکو بەهۆی بزوێنێکی ئاشکراوە کە وا بوونێکی هەمیشەیی هەیە لە ڕستەدا و ناشێ بە هیچ جۆرێک بن لێو بخرێ وەک «تنوین». لە هەر حاڵێک و هەر زەرفێکدا بزوێنەکەت لادا و گوتت «دارا مەرد» ڕستەکە واتا دەدۆڕێنێ، لە ڕستەیی دەکەوێ. بەڵێ دەتوانی جێگەی بزوێنەکە بگۆڕی و بڵێی «دارایە مەرد» کە ئەوسا بەولای «حکم و اسناد» ەوە واتاییێکی زیادیشت دەربڕیوە وەک «مبالغە» یاخود مەدح بێ.

دەمێنێتەوە بزانین کە ئەم بزوێنە فیعل نەبێ دەبێ چی بێ؟

بەر لەوە لە پرسیاری «چیە» بتوێژینەوە با سەیرێکی جێگەی بزوێنەکە بکەین لە ڕستەدا:

- من مەردم.
- تۆ مەردی.
- ئەوان مەردن.
- ئێمە مەردین.
- ئەو مەردە، خۆی مەردە، دارا مەردە.

چ گومانیک نیە لەوەدا بزوێنەکە جێی ڕاناوی چالاکی پڕاوپڕ گرتۆتەوە و وەک ئاوەڵەکانی هۆی «حکم و اسناد» ە لە ڕستەدا. بەڵام کە ئەمە وا بێ، لە صەدی صەد وایشە، ئاخۆ ڕاناوە؟

لێرە بە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد لە کوردیدا بۆ پێک هێنانی ڕستەی بێ فیعل راناوی ڕابردوی تێنەپەڕ بەکار دێ، واتە هەر وەک دەڵێی «ئێمە ڕۆیشتین» دەشڵێی «ئێمە مەردین». چاکتر ئەوەیە لیستەیێک ڕێکخەین بۆ ڕونکردنەوەی ئەو بەدیهیە، دەڵێی:

- من ڕۆیشتم      من مەردم
- تۆ ڕۆیشتیت      تۆ مەردیت یاخود ڕۆیشتی، مەردی.
- ئێمە ڕۆیشتین      ئێمە مەردین.
- ئێوە ڕۆیشتن      ئێوە مەردن.
- ئەوان ڕۆیشتن      ئەوان مەردن.

کە بێینە عاست کەسی سییەمی تاک دەڵێین:

ئەو ڕۆیشت.

لەم فیعلەدا، وەک پێشتر گوتمان، ڕاناوی چالاک نیە، کەواتە بۆ پێک هێنانی ڕستەی وەک «تۆ مەردی، من مەردم» ناتوانین ڕاناوی چالاک بخوازینەوە لە فیعلی ڕابردوی تێنەپەڕی کەسی سێیەمی تاک، چونکە راناوی چالاکی نیە. بەم جۆرە کە بێین و چاوەنۆڕی ڕاناوێکی نامەوجود بکەین پەکی وتووێژمان دەکەوێ لە هەموو ئەو ڕستە بێ فیعلانەی کە خاوەنەکانیان کەسی سێیەمی تاک بێ چونکە دەزانین لە کوردیدا ڕستەی بێ فیعل واتا نابەخشێ بێ ڕاناوی چالاک.

لەم سرنج گرتنەڕا دەردەکەوێ ئەم بزوێنەی کۆتایی «دارا مەردە» و هەموو ڕستەیێکی وەک ئەو، ناچاریی هێناوەتی و جێی ڕاناوی چالاکی کەسی سێیەمی تاکی پێ گرتۆتەوە بۆ دروست کردنی ڕستەی واتادار، کە ئەمە نەکرابایە

دەبوو ڕستەی بێ واتا بەکار بێ وەک «دارا مەرد، زستان سارد، براکەت زیرەک» یاخود ئەو ڕستانەی سەرلەبەریان یاساغ بکرێن کە ئەمە شتێک نیە خەیاڵ بۆی بچێ.

ڕەنگە کەسێک بڵێ خۆ لە فیعلی ڕابردووی تێنەپەڕیش ڕاناوی چالاک نەبوو بۆ کەسی سێیەمی تاک کەچی بە سەلیقە دەزانین فیعلەکە واتای تەواوی هەیە «بە حکم و اسناد» ەوە. کە دەگوترێ «هات، ڕۆیی، نووست، برژا، سووتا، فڕی...» بەقەدەر «هاتم، ڕۆیشتین، نووستین، برژاین...» لەبەر زەوق و زیهنمان ڕاست و دروستە و هیچ ناتەواوییێکیان لێ هەست ناکەین، کەواتە ڕەنگ بوو ئەگەر لە ڕستەی بێ فیعلیشدا راناوی کەسی سێیەمی تاک نەبا پێی ڕاهاتباین و لێمان بە نووقستانی نەگرتبا. بەڵێ ڕەنگە شتی وەها بگوترێ، خۆ ئەگەر کەسیش نەیڵێ وا من گوتم. بەڵام قسەکە جێی قەناعەت نیە، کە باشی لێ ورد بیەوە.

جارێ هەر لە پێشەوە خاوەنی زمانەکە وەرامی داوەتەوە بەوەدا کە ڕازی نەبووە ڕستەی بێفیعل بێ راناوی چالاک بێ، ڕاهاتن و رانەهاتنیش لە زوەوە دەرگەی باس لێ کردنی بەستراوە چونکە زەوقی کوردی خۆی لە عاست دوو «احتمال» ی بوون و نەبوونی ڕاناوی چالاک نەدیوە تاکو ڕێ هەبێ خەیاڵمان بڕوا بۆ «احتمال» ی پێ ڕاهاتن. تاکە «احتمال» هەر ئەوە بووە کە دەبێ ڕاناوی چالاک لە ڕستەی بێ فیعلدا ببێ، ئەگەر نەبوو پێویستە بۆی خەڵق بکرێ.

بە نیسبەت نەبوونی ڕاناوی چالاک لە بەشی هەرە زۆری فیعلەکان بۆ کەسی سێیەمی تاک و لە فیعلی «أمر» بۆ کەسی دوەمی تاک، تەعلیلێکی ڕێکوپێک هەیە کە ڕاستەوخۆ لە «فقه» ی زمانەوە هەڵدەقوڵێ، بەڵام زۆر بە داخەوە، وەک زوتر عوزرم هێنایەوە، ج دەرفەت و مەودای شیکردنەوەی ئەم جۆرە لاباسانە لە گوتارەکەدا نەماوە، بۆیێ بە ناچاری لە بیر خۆمی دەبەمەوە و

دەگەڕێمەوە بۆ ئەسڵە باسەکە و وەرامی دوا پرسیاری سەر بەو بزوێنەی کۆتایی ڕستەی «دارا مەردە» دەدەمەوە و خەریک دەبم بزانم ئەم بزوێنە لە کوێوە هاتوە.

هەرچەند لێم ڕوون نیە لە کەیەوە کورد وێنە ئاخاوتنی ئێستاکەی بەکار دێنێ و لەبەر ئەمە ناتوانم سەرچاوەی مێژوویی بۆ کەرستەیێکی تەعبیری وەک ئەم بزوێنە دەست نیشان کەم و بیخەمە پەراوێزی زەمەنی خۆیەوە، دیسانەوە تێکڕای زمانەکە، وەک میراتێکی مێژوویی، تایبەتیەکانی ڕەسەنی کۆنینەی خۆی پاراستووە تا ئەو ڕادەیە کە شارەزاییەکی گشتی و ورد بە تەرکیبی ناوەکی زمانەکە و میکانیزمی هاتنە گەڕی دەستوورەکانی دەسەڵات دەدەن بە تۆژەرەوە تەعلیلی گەلێک لەو زاهیرە و ڕواڵەتانەی بکا کە بنجی مێژووییان نادیارە. لە فەرزی پێکانی نیشانەش زەحمەت بێ لەو زیهنکاریانەدا، کوتانەوەی ڕێبازەکانی زمان ئاشنامان دەکا بە تێک کردنەوە و لەیەکدی ترازان و ڕاستایی و پێچە بە دەورەیان، ئیتر وەک بەڵەد بتوانین دەوری نیشان هەڵبێنین، کە نەشیپێکین.

زانیمان ناچاریی ئەم بزوێنەی هێناوە تاکو جێی ڕاناوی چالاک پڕ کاتەوە لە ڕستەی بێ فیعلدا. ئێستا پرسیار لەوە دەکرێ بۆچی ئەم ناچارییە شتێکی تری نەهێنا؟ چ دەقەوما بگوترابا «دارا مەردک، یاخود مەردش، یاخود مەردوف» یا هەر شتێکی تر بێ؟ بێگومان چ نەدەقەوما، بەڵام ئەوساش پرسیارەکە هەر بە ملەوە دەما و دەگوترا بۆچی ئەم پیتە، یا کۆمەڵە پیتە هات زیادە لە هەموو شتێکی تر؟

من ئەوەندەی تێدەفکرم لەوە کە ئەمرازێک یاخود هۆییێکی تەعبیری ڕێکوپێکتر و ئاسانتر و سوکتر لەم بزوێنەیە بدۆزمەوە و بڵێم دەبوا سەلیقەی کورد ئەوی هێنابا و کەلێنی ناچاریی پێ پڕ کردبایە، ناگەم بە هیچ ئەنجامێک، ئەو ئەنجامە نەبێ کە زمانی کوردی لە خۆوە و بێ مامۆستا ئەم

بزوێنەی هێناوە کە کەمترین میقداری ئاخاوتنە و لەو کورتتر چ دەنگ پەیدا نابێ، و کردوەتی بە مزە و باجی ناچاریی!! جەردەیە و ڕێی پێ گرتووم دەیەوێ شتێکم لێ بسەنێ، منیش بە تاکە یەک «فلس» لە کۆڵ خۆم کردەوە و ڕێگەم پێ چۆڵ کرد. بە جگەرە ڕازیم کردبا لە فلسێکی پتر دەگرتەوە.

کەواتە بیر و باوەڕی من ئەوەیە کورد بە ئەسڵ لەبەر ناچاریی ئەم بزوێنەی هێنا و لەمەشدا کەمترین ئەرکی بە خەرج بردوە چونکە لەوە کەمتر و سووکتر چنگ ناکەوێ.

بێگومان لە کوردیدا «ئاسانی تەعبیر» یەکێکە لە تایبەتەیەکان و مەبەستەکانی ئاخافتن. لە گوتاری «بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا» کە لە بەرگی یەکەم - بەشی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاو کرایەوە هەوڵم داوە ئەم لایەنەی زمانەکەمان نەختێک ڕوون کەمەوە لە ڕێی ڕوون کردنەوەی سروشتی نەرم و شلی دەنگی «ی» وە کە بەزۆری لە پێک هێنانی ڕستە و واتادا بەکار دێ. ئەم بزوێنەی «ە» ش هەمان سروشتی بایەخداری هەیە بەڵام لە ڕوی زێدە کورتییەوە. ئەوەی ڕاستی بێ بزوێنی «ە» هێندە کورت و «مختصر» ە بە بەریەوە نیە نەرم و شل بێ. بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو کورتییەشدا هەرگیز ناشێ تێبچێ، کە وەک ڕاناو بەکارهاتبێ، چونکی نەمانی ڕاناوەکە واتای ڕستەکە لەناو دەبا. لەبەر ئەم هۆیە گرنگەیە کاتێک کە بکەوێتە دوای وشەیێک کۆتاییەکەی بزوێن بێ «یێی» پەیوەندی دێ و دەبێتە ئیستگە تا بزوێنەکە خۆی بەسەرەوە بگرێ. دەڵێی «ئەمە چرایە، لەسەر چاوت برۆیە، ناوت چییە، پارەم پێیە، منداڵ حەزی لە گەمەیە». کە کۆتایی وشە «واوی تیژ» بوو وا دەبێ بزوێنەکە دەخەنە سەر واو، واش دەبێ «یێ» ی پەیوەندی [20] بۆ دێننەوە. دەگوترێ «جارێ زووە، جارێ زوویە». ئەم ڕاستییە، بەرەو دواوە، تیشکێک داوێ بۆ سەر یەکێک لەو مەوزوعانەی پێشتر لێی دواین.

ئەو لەهجە کوردییەی کە دەڵێ «دارا مەردەس» چ پێی پەیوەندی ناهێنێ بۆ پاراستنی بزوێنەکە، بە پێچەوانە بزوێنەکە تێدەبا و هەر سینەکە دەهێڵێتەوە و دەڵێ «چراس، برۆس...». کە سرنج بگرین دەبینین فارسیش هەر وا دەکا، واتە دەڵێ «بالاست، نیکوست...». لەمەڕا دەردەکەوێ ئەم لەهجە کوردییە بەهۆی نزیکی و دراوسێیەتی لەگەڵ فارسدا سینەکەی هێناوەتە ناو ئاخاوتن و هەندێک لە ڕاستە شەقامی کوردی دورکەوتۆتەوە، بزوێنەکەی «دارا مەردە» ش پاشماوەی «است» ی فارسی نیە و بەچکەیێکی زادەی کۆشی زمانی کوردییە.

ئەم بزوێنەی «ە» بەهۆی سووکی و کورتییەوە بۆ مەبەستی تریش بەکار دێ لە ئاخافتندا، بەڵام دیارە لەو حاڵانەدا «حکم و اسناد» پێک ناهێنێ، وەک ئەوەی لەگەڵ ئیشارە و ئەمڕازی «تعریف» دا خۆ بە وشەوە دەلکێنێ، دەڵێی «پیاوەکە، ئەم پیاوە، ئەو پیاوانە، پیاوەکان...». وا دەبێ کە بەدوا بزوێندا هات یێیەک دێ و دەیپارێزێ واش دەبێ تێدەچێ، دەڵێی «ئەم برایە، ئەم پەنجەرەیە» کە لێرەدا پارێزرا، بەڵام لە ڕستەی وەک «پەنجەرەکە داخە، براکەت ڕۆیشت» تێچوو. شێوەی تریش هەیە بۆ تێبردن و پاراستنی بزوێنەکە لە لەهجەی تری زمانی کوردیدا وەک کە لە ناوچەی کۆیێ و زۆر شوێنی تری کوردستاندا دەڵێن «برایەکەم هات، ئەو پەنجەرە داخە»

وا دەبێ بۆ دارشتنی وشەی تازەش بزوێنەکەی «ە» بەکار دێ، دەڵێی «چاک، چاکە - خراپ، خراپە - دەست، دەستە - لێکەوتە - کردە و بردە...». کە خەریک بێ گەلێ جۆری تری بەکارهێنانی ئەم بزوێنە دەدۆزیتەوە لە زمانی کوردیدا، کە ئێرە جێی هێندێ نیە.

کەواتە پوختەی باوەڕی من دەربارەی بزوێنی ڕستەی وەک «دارا مەردە، ڕێگاکە سەرەو لێژە...» ئەوەیە کە ناچاریی هێناوەتی بۆ دروست کردنی

«حکم و اسناد» له ڕستەی بێفیعلد، لەم کارەشدا بە ئەرکی «ڕاناوی چالاک» هەڵدەستێ، کەواتە:

- ئەم بزوێنە جێی ڕاناوی چالاکی گرتۆتەوە.
  ئەم بزوێنە بۆتە ڕاناو.
  ئەم بزوێنە ڕاناوە.

**ڕوون کردنەوە**

لەم گوتارەمدا نیشانەی سەر «ی» ی درێژی قوچاوم هەر بۆ ئەو «ی» ە بەکارهێناوە کە نەلکاوە بە پێش خۆیەوە وەک وشەی «کوردی- ، بڵاوی- ...». قاڵبی ئەم «ی» ە لە شکڵی لکاوی بە پیتی ترەوە، نیشانەکەی «-» وەک دوو خاڵی پیتی «ت» خۆ دەنوێنێ، بە داخەوە ئەم هەڵەی ئەو ساختمانەیە کە پیتەکانی داڕشتوە بۆ چاپی کۆڕی زانیاری کورد، وا کۆڕ خەریکە پیتی تر دادەڕێژێ کە خۆشخوێن بێ[21] .

دیسان دەسپارێزیم نەکردوە لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە بۆ مەبەسی تێگەیاندن. زاراوەکانی «ماضی، مضارع، أمر، حکم، اسناد، مطلق، فعل، فاعل، مفعول، مصدر، ظرف، صفە، موصوف...» و گەلێکی تری وەک ئەمانە هەموو کەس تێیان دەگا، لەوانەبوو کە وەرمگێڕابانە سەر کوردی، بەهۆی ئەوەوە کە وا جارێ خەڵق پێیان ڕانەهاتوە، واتا و مەبەسی نووسینەکە بەلای گەلێ کەسەوە وەزەحمەتتر کەوتبا.

خۆم ئازاد زانیوە لە پەیڕەوی کردنی جۆری ڕێنووس، چونکە تا ئێستاش بڕیارێک دەرنەچووە بۆ دەست نیشان کردنی یەکێک لەو جۆرانەی لە باودان. تا ئەو ڕۆژەی بڕیارێک شوێن خشکەی خامە ڕون دەکا و بەسەردا ڕۆیشتنی بۆ دەکا بە دەستوور، من و تۆ و هەموو کەسێک دەتوانێ یەکێک لە ڕێنووسە ئاشناکان بکا بە گەشگەشەی خامەی.

ئاغڵەب باسەکان کە لێیان دواوم گەلێک زیاتر لێکۆڵینەوە و تۆژینەوە و درێژە پێ دان هەڵدەگرن، هەندێک باسیش هەن هەر بە جارێ لێیان خامۆش بووم. ئەوەی ڕاستی بێ، لەبەر تازەیی تۆژینەوەی «فیسلۆلۆجی» لە کوردیدا، بە تایبەتی لەبەر کاری وێرانکەری لاسایی کردنەوەی بێگانە لەو هێندە تۆژینەوە کەمەی کە تا ئێستا خراوەتە کۆڕی ڕۆشنبیری کوردییەوە، زوربەی سەرە

باسەکانی زمان، هەریەکەیان هەڵدەگرێ کتێبی دوور و درێژ و بەهێز و پێزی لەسەر بنووسرێ. باسی «ضمیر، ڕاناو» بە کتێبێک تەواو نابێ کە بمانەوێ لە هەموو بارێکیەوە لێی بدوێین، دەشێ لە هەڵکەوتی دوارِۆژدا بۆ خۆم خەریکی تەواو کردنی بەشێک لەو باسانە بم کە بە ناتەواوی لەم گوتارەدا لەسەرم نووسیون.

گۆشەگیریم کرد لە ناو هێنانی ئەو نووسەرانە کە ڕەخنەم لە ڕایەکانیان گرتوە، تاکە ناوێک نەبێ کە تێرادیتەیی برایەتی و ئاشنایی میانمان زاڵی کردم بەسەر دوودڵی کردن لە دەربڕینی، خۆ ئەگەر هاتبام یەک یەک ناوی نووسەرەکانم هێنابا و ڕایەکانم بە درێژی هەڵسەنگاندبان، ئیتر هەر نەدەگەیشتم بە کۆتایی گوتارەکە، کە وا لەگەڵ هەموو مەودا لێ کورت کردنەوەشی هێندە خۆی لێک کێشایەوە کە مەجبوورم بکا تکای بەخشین بکەم لە خوێنەرانی بەڕێز.

«...»

## پەراوێزەکان

1- بڕوانە: گۆڤاری «سۆمەر» بەرگی 16، ساڵی1960، ل15.

2- شاعیری عەرەب ڕاستی کردوە لەوەدا کە گوتوەتی:

کل سر جاوز الاثنين شاع
کل علم ما حوته الکتب ضاع

دەشڵێن مەبەست لەم «أثنين» ە دوو لێوە نەک دوو کەس

3- بەشی یەکەمی ئەم کتێبە لە ژمارە یەک و بەشی دوەمی لە ژمارە دوی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» دا بڵاوکراونەتەوە.

4- ئەم کتێبە لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردە، ڕینووسی کۆڕ بۆ «ی» درێژ و «و» ی درێژ بریتی بوو لە دانانی هێڵیکی کورت لەسەر پیتەکان. مامۆستا مەسعوود مەبەستی ئەو ڕێنووسەی کۆڕە و لە کتێبەکەدا «ی» کورت و «ی» درێژ بەو خەتەی سەر «ی» یکەی جیاکردۆتەوە. بەڵام لە نووسینەوەی ئەم کتێبەدا بە کۆمپیتەر بۆ «ی» درێژ دوو پیتی «یی» بەکاردەهێنین کە لە ڕاستیدا هەڵەیە و بەشێکە لە کەماسی ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردی. (بەرپرسی سایتی مامۆستا)

5- پەڕاندنی پیتی «ا» نەک هەر لێرە، لە شوێنی دیکەشدا ڕەچاو دەکرێ وەک لەو میسالانەدا، دەڵێی «دەستاودەست، دەماودەم، دزاودز، دەشتاودەشت» بە زیاد کردنی دو پیتی «ا، و». بەڵام دەڵێی «ماڵەوماڵ، بانەوبان، شانەوشان، دارەودار، شاخەوشاخ، زارەوزار» بە زیاد کردنی دو پیتی «ە، و». دیارە لەو وشانەدا چونکە پیتی «ا» هەیە بۆ مەبەسی سوک گوتن پیتی «ا» گۆڕاوە بۆ «ە» دەنا دەبوا بگوترێ «مالاوماڵ، باناوبان، شاخاوشاخ...»

6- فیعلی «تۆپی» ئەویش وەک مردن وایە، هێندە هەیە بۆ جانەوەر بەکار دێ نەک مرۆڤ، لە جانەوەریشدا غالب بۆ ئەوانە بەکار دێ کە گۆشتیان ناخورێ.

گۆشت نەخوراو پێی دەگوترێ «تۆپیو» گۆشت خوراو پێی دەگوترێ «مردار» ... مرۆڤیش پێی دەگوترێ «مردو».

7- لێرەدا مناقەشەی ئەوە ناکەم پیتێک کە لە کۆتایی فیعلەوە ببێ و بزوتنەوە و گۆڕان و انتقال پەیدا بکا داخوا پاشگرە یا ئەمڕاز.

8- لیژنەی ڕێزمانی سەر بە کۆڕی زانیاری کوردەوە، دوای لێکدانەوەیێکی دوور و درێژ «کار، کارا، بەرکار» ی پەسەند کرد بە واتای «فعل، فاعل، مفعول» لێرەدا ماوەی شەرح دان نیە، کە پێویست بوو خۆم ئامادەم گۆشەی نیگای لیژنە ڕوون کەمەوە.

9- ساغ کردنەوەی پێشخستن و پاشخستنی ڕاناوە لکاوەکان لێرەدا جێی نابێتەوە پێویستە بە وردی باس لەوە بکرێ ئایا «کتبتهم» بنووسرێ «نووسیمن، نووسینم، نووسیانم، نووسیمیان». کە دەرفەتم ببێ لە شوێنی خۆی لەم گوتارەدا هەندێکی لەسەر دەنووسم، ناشتوانم لە ئێستاوە بەڵێن بدەم چونکە بۆ خۆم نازانم سنووری نووسینەکەم تا کوێ دەڕوا و چ ڕوپێوێک «مساحە» دەگرێتەوە، لەبەر زێدە بەر فرەوانی مەوزوع.

10- شەرحی ئەم زاراوە گەلێک پتری پێ دەوێ، بە داخەوە لێرەدا دەرفەت نیە.

11- بە ئانقەست ئەم ڕستەیەم هێنا تا بڵێم دەشێ لێرەدا فیعلێکی قرتاو هەبێ و بە ئەسڵ «سەیری کە» بووبێ، بەڵام «چەند جوانە» بۆ خۆی بێ فیعلە.

12- مەبەستم ئەو بزوێنەی «ە» یە کە لە کۆتایی ڕستەکەدایە «دارا مەردە»، بەلای منەوە بزوێنەکە جێگەی «ڕاناوی لکاو» ی گرتۆتەوە.

13- دەمدزێ: لە دزینەوە نەهاتوە، بە ئەسڵ لە وشەی «دزێو» وەرگیراوە، دزێویش بە واتای «ناشرین» دێ، کەواتە دەمدزێ «پێم دزێوە - یقززنی» یە. ئەوەی ڕاستی بێ ئەم کۆمەڵە فیعلە، هی تریش هەن، لە کوردیدا سروشتی تایبەتی خۆیان هەیە و مامڵەتیان لە هەندێ ڕووەوە لە فیعلی تر جودایە وەک ئەوەی کە لە «ماضی» دا ڕاناوە لکاوەکەیان «فاعل» ەو و لە «مضارع» دا دەبێتە مەفعول: «پەرژام، دەمپەرژێ – دزام، دەمدزێ – ویستم، دەمەوێ».

بەسەهوو مەچۆ لە ڕاناوەکەی فیعلی دەمەوێ بەوەدا کە وەک فاعیل بێتە پێش چاوت: ڕاناوی لکاو لە «مضارع» دا نایێتە دوای نیشانەی «دە» ی مضارعەوە بە مەفعولی نەبێ وەک «دەمنوسێ، دەمبینێ، دەمکا، دەمخوا...» فیعلی «دەمەوێ» واتاکەی دەبێتە «یعوزنی» هەرچەند لە ڕابردوودا «ویستم» بە واتای «طلبت، أردت» ش بێ.

سەیرێکی فیعلی «دەمخورێ» بکە، هەرچەند لە ڕابردوودا «خورام» تێنەپەڕە و چ مەفعولی پێ ناوێ، لە مضارعدا ڕاناوەکەی «م» بوە بە مەفعول بەپێی دەستوور دەبوا بۆ دروست کردنی فیعلی تێپەڕ لە «خوران» هەر خوراندن هەبێ و بگوترێ «خوراندمی، دەمخورێنێ» کەچی وا لە مضارعدا مامڵەتی بە تەواوی هی تێپەڕە بە بێ زیاد کردنی پاشگری «اندن». مەوزوع پتری بە بەرەوە هەیە و پێویستی بە «استقراء» یش زۆرە، بەڵام لێرەدا جێی نابێتەوە، جێگاکە خۆی چی تری بەبەرەوە نیە.

14- تێبینی خوێنەر بمبورێ لەوەدا کە ناتوانم باسی صیغەی «خبری وانشائی» کارەکان لێرەدا شەرح بدەم و جیاوازی میانی واتای «خبری وانشائی» ش ڕوون کەمەوە.

15- لەم شوێنانەدا مەبەس «دەنگی پیتەکا» ە، پیت بۆ خۆی نیشانەی دەنگە.

16- لە گوتاری «بەکارهێنانی «ی» لە ڕیزمانی کوردی» کە لە یەکەم ژمارەی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوکرایەوە، بەراوردیێکی مەیلەو ورد هەیە دەربارەی ئەو ییانەی هەمیشە بزوێنن و ئەوانەی لە بزوێنی دەکەون ، خوێندنەوەی ئەویان یارمەتی تێگەیشتنی ئەمیان دەدا.

17- دەتوانم بڵێم بوونی «فاعل، کارا» یێکیش بە زەرورەت دێتە زیهنەوە. خۆ ئەگەر گوتبام «هاتم» فاعیلەکە وجودیشی لە فیعلەکەدا دیار دەکەوت، بەڵام وجودی فاعیل لە دەرەوەی فیعلەوە دێ و ڕەگەزی فیعلەکە نیە، دەبینی هەر جارە فاعیلەکە دەگۆڕێ «هاتم، هاتین، هاتی، هاتن...»، بەڵام ڕودان و کاتەکە هەر خۆیانن. بێگومان بەسترانەوەی فیعل بە فاعیلەوە لەو زمانانەدا کە ڕاناوی چالاکیان هەیە زیاتر دێتە بەر هەست تا ئەو زمانانەی ڕاناوی چالاکیان نیە. کە دەڵێی «من نووسیم» بەهۆی دەنگی «م» لە کۆتایی فیعلەکەدا کە بووە

بە کەرتێکی چڕمساوی وشە، شەخسی فاعیلت هێندی فیعلەکە لەبەرچاوە بەڵام کە دەڵێی «I wrote » بەهۆی وشەی «I» نەبێ فاعیلەکە نایێتە بەر هەستی مرۆڤەوە، واتە وشەی «Wrote» خۆی لە خۆیدا کەسی یەکەم بە دەستەوە نادا، لە ڕاستیدا هیچ کەسێک بە دەستەوە نادا... قسە درێژەی زیاتر هەیە بەڵام دەرفەت نیە.

18- عادەت وا ڕۆییوە بگوترێ «ڕاستی» دەنا ئیمکان هەیە ڕستەکە درۆی تێدا بێ یاخود کابرای قسەکەر مەبەستی درۆ بێ. زاتەن ڕستەی «خبری» ئەو ڕستەیەیە کە هەڵدەگرێ راست بێ یا درۆ بێ وەک ئەوەی بڵێی «داری گوێز لە قەزوان بە عومرترە، دارا ئامۆزامە». واش دەبێ ڕستەی «خبری» هەر درۆی ڕوتە وەک: شاخی هەورامان لە فەرەنسەیە. لە ڕستەی «خبری» دا بڕیار هەیە کە پێی دەڵێن «حکم و اسناد» ئیتر بڕیارەکە ڕاستی و درۆیی هەڵدەگرێ. فەرقێکیش نیە لەوەدا ڕستەی «خبری» فیعلی تێدا بێ یا نەبێ: باران باری، سبەی دەچمە پردێ، داراکەم ئاو دا...هەموویان ڕستەی «خبری» ن. ڕستەی «انشائی» درۆ و ڕاستی هەڵناگرێ وەک کە بڵێی: کاشکی نەچووبام، خوایە لێم خۆش بی، هەستە لەوێ لا کەوە.

19- تروکە: بە واتای «لحظە» دێ. هەردو وشەی «تروکاندنی، لحظ» لە چاوەوە سەر هەڵدەدەن.

20- وشەی «پەیوەندیی» بۆ ئێرە دەست نادا بەڵام ماوەم نیە بە دوا وشەیێکی تردا بگەڕێم.

21- ئەم ڕونکردنەوەیە داڕشتنەوەی کتێبەکە بە کۆمپیوتەر ناگرێتەوە هەروەک لە پەراوێزی ژمارە 4 ڕوون کراوەتەوە (بەرپرسی سایتی مامۆستا).

«...»